وڤلێتی عیرفانی

# چاوی ماسی

نووسینی

تەحسین حەمەغەریب

# ناسینی ئاو

ماسیە گەورەکە دەیزانی کە ماسیە بچووکەکان
لەئاو تێناگەن چونکە ئەوان بۆ ئەوەی ئاو بناسن
دەبوو پێشتر خۆیان ناسیبێت...
ماسیە گەورەکە لەوە تێگەیشتبوو، ئەو ماسیە
وردانەی بنی دەریا، ئەوانەی قەد بەرەو سەر ڕووی
دەریا عروجیان نەکردووە و هەرگیز تیشکی خۆر بەر
پولەکە شین و زیوین و سەوزەکانیان نەکەوتووە...
ئەو ماسیە بچووکانەی بەچاوە هەمیشە کراوەکانیان
لەڕووی دەریاوە سەیری ئاسمانیان نەکردووە
(ڕووی دەریا ئەو جێیەی ئاو تەنیا توێژێکی تەنکی
دەمێنێ، ئەو ئاستەی دەریا کە ماسی تا نەگاتە ئەوێ
قەد هەست ناکات لەدەریادا دەژی و جیهانێکی دیکەی
جیاواز لەو جیهانەی ئەو هەیە.) نازانێت ئاسمانێکی
شین بەو لاسەرەی ئەوەوە هەیە، ڕەنگە ئەویش

دەریایەکی زۆر فراوان بێت و لەم دەریای زەویە بڕوانێت، ئەو دەیزانی ئەوان لەدەریا تێناگەن، چ جای مرۆڤ.

ئەو ماسیانەی کە ئەوی بە ئەزموون مامۆستایانە و دەبێت وانەکانی ژیانیان فێر بکات، ماسیە حەکیمەکە لەوە دڵنیابوو ئەو ناتوانێت ئەو هەزاران هەزار شتەی بەچاوی ماسیانەی خۆی بینیویەتی بۆ ئەوانی بگێڕێتەوە، ئەو دەزانێت تاکە ئامرازی فێربوونی ئەوانی ماسی چاویانە، بۆیە ماسیەکان بۆ ئەوەی زۆرتر فێربن دەبێت زۆرتر ببینن، ئەو دەیزانی ئەوان لەو حیکمەتە تێناگەن، ئەو ماسیانەی ناجوڵێن لەماسیەکانی دیکە تەمەڵترن، چونکە ئەوان وەک شاخ وان کە هەمیشە بێجوڵە ڕاوەستاون و تەنیا یەک تابلۆ دەبینن، ئاو دەجوڵێ و بەهۆی ئەو جوڵانەوەشیەوە زۆر دەبینێت، ئیدی با شاخ بەرز بێت، بەڵام هەرگیز بەقەد دەریا نازانێت.

ماسی لەئاوە و دەبێت وەک ئاویش گەڕیدە بێت، دەبێت هەرچی زۆرترە هەوڵی بینینی زیاتر بدات، دەبێت وەک ئاو بڕوا و بڕوا... ئەو لەوە حاڵی بوو بوو تەنانەت دەریا گەورەکانیش ئەو دەریایانەی بە ڕووکەش وەستاون ئەوانیش دەجوڵێن، بەڵام ماسیە بچووکەکان لەمە تێناگەن، ئەو دەیویست .هەموو ئەو

حیکمەتەیان فێر بکات کە دەریا بەو فراوانییەی خۆی فێری کردووە.

ماسیە گەورەکان بەچاوی پڕ لە میهرەوە سەیری ماسیە وردەکانیان دەکرد، ئەو ماسیانەی بۆ ئەوەی لەنگەری خۆیان رابگرن ورد وردێک کلک و باڵ و پولەکەکانی خۆیان دەبزواند، بەدەم و لووتیان ئاویان دەمژی و بە گوێچکەکانیان دەیاندایەوە.

ئەو لەدڵی خۆیدا دەیووت قەد لە جیهانی دەرەوەی دەریا تێناگەن، هەتا بەرەو سەرەوەی دەریا سەرنەکەون، دەیزانی ئەوان نەڕووی دەریا دەناسن کە خۆر لەکاتی هەڵهاتنیدا بەدەریای دەبەخشێ، نە دابەزینی خۆریان بۆناو دەریا بینیوە. ئەو دەمەی خۆر بەتەواوەتی گڕی گرتووە و خەریکی خۆ سوتاندنە، ئەو کاتە ڕاست دادەبەزێتە ناو دەریا و ڕوومەتی دەریا گەرم دەکات و گڕی هەناوی خۆی بۆ نوور دەگۆڕێ و پاک پاک خۆی دەشوات و خۆی فێنک دەکاتەوە و پاشان، پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ دەڕواتەوە ئاسمان. ئەو کاتەی تیشکەکانی فێنک و سپی و شوشەیین و ئەو قژە تیشکیە تەڕبووانەی بەدەم باوە دەدا و دەڕوات خۆی بەو دیو شاخەکاندا دەکات، بۆ سبەینێش پاش ئەوەی تیشکەکانی وشکبوونەوە دەیاندات بەدەم باوە و بەر خۆیان دەدا

و بەرەو دەریا دەگەڕێتەوە و، لای نیوەڕۆ دووبارە بۆ مەلەکردن دادەبەزێتە دەریا و ئەمە کاری ڕۆژانەی خۆرە، کە ئەمانی ماسی بەچاوی هەمیشە کراوەی ماسیانەی خۆیان سەیری دەکەن، ماسیە گەورەکە کە سەیری ماسیە وردەکانی دەکرد، بیری لەوە دەکردەوە چۆن لەو شتانەیان تێبگەیەنێت کە ئەوان نەیانبینیوە (ماسی بێجگە لەو دووچاوە دانەخراوەی کە دەبینن شتێکی دیکە نییە) ئەو لە دڵی خۆیدا دەیووت: (ئەوان ساتەکانی دوای پشتهەڵکردنی خۆریان نەبینیوە ئەو کاتەی ئەستێرە جوانەکان دەردەکەون، ئەو ئەستێرانەی لەترسی خۆر نەیانوێراوە خۆیان پیشان بدەن، کە خۆر ڕۆیشت ئیدی ئەوانیش لەسەرەتاوە و یەکە یەکە و پاشان بە کۆمەڵ دەردەکەون. ئەو ئەستێرانەی جەستەیان چرای ئاگرینە و لەگەڵ ئارای شەودا دێن بۆ مەلەکردن و خۆیان هەڵدەدەنە دەریاوە، ئەو هەزاران هەزار ئەستێرەیە ملیۆنان ملیۆن فرسەخ دەبڕن و ئاسمان تەی دەکەن و هەموو شەوێ دێن و جەستەی نوورینیان لەدەریادا پاک دەشۆن، دێن بۆ ئەوەی بەشەرمی لە ڕادەبەردەری مانگ لە ئاسماندا پێبکەنن، ئەو پێکەنینەی ئەوان چاوی هەمیشە کراوەی ئەمانی ماسی پڕ لە خۆشی دەکات، کەلەژێر توێژێکی زۆر

تەنکی ئاوەوە سەیری جەستەی نوورینی ئەستێرەکان دەکەن، ئەمانی ماسی چاویان لێیە بێئەوەی ئاهەنگی مەلەکردنی ئەستێرەکان تێکبدەن، ئەو کۆمەڵە ئەستێرەیە دەبینن دەچنە ئاسمان و دەستی مانگی شەرمن دەگرن و بۆ ناو دەریای دادەبەزێنن، مانگ لەڕووتی خۆی شەرم دەکات و پەردەی تاریکی شەو بەخۆیدا دەدات، بەڵام ئەمە دادی نادات، چونکە ساردی ئاوەکە و ئاو پژاندنی ئەستێرەکان جلە ڕەشەکانی تەڕ دەکەن، ئیدی مانگ زاتی دەشکێت و خۆی دەخاتە نێو ئاوی دەریاوە.

(گەلێ لە ئەستێرەکان باوەڕیان وایە خۆر عاشقی مانگە و لەوەتەی هەیە بەدوویدا وێڵە، بەڵام هەرگیز پێی نەگەیشتووە، مانگیش هەتا خۆر دیاربێت نایەت بۆ ناو دەریا و خۆی ڕووت ناکاتەوە) ئەم کەرنەڤاڵەی ئەستێرەکان لەدەریادا تا بەیانی بەردەوامە، تا ئەو دەمەی خۆر و قژە تیشکەکانی کەلەبەردەمیدا بەدەم باوە دەجوڵێن پەیدا دەبن، ئیدی ئەستێرەکان بەجەستەی نوورینیانەوە دەچنەوە ئاسمان و لەچاو ون دەبن، ئەمانی ماسیش ئاگایان لەو هەموو کەین و بەینەیەو بەچاوی هەمیشە کراوەیان تەماشایان دەکەن.

ماسیە وردەکانی شەو ئەوەیان نەبینیوە کە هەورەکان دێن و سەری دەریا دەژەنن و ملیۆنەها دڵۆپە بارانی خۆیان دەبارێننە دەریاوە، چاویان بە کەوتنەخوارەوەی بەڕیتم و دەنگی مۆسیقایانەی ئەو دڵۆپە بارانانە نەکەوتووە کەدەکەونە دەریا و پەیامی شوێنە دوور دوورەکان دەگەیەننە دەریا و، دواتر ڕۆحیانی پێ دەبەخشن و لە دەریادا دەتوێنەوە.

ئەوانی وردەماسی نە وشکانی و نە هەزاران هەزار جۆری گیانداری تووکن (بەتایبەتی مرۆڤ) ناناسن، ئەو وشکانییەی ئەمانی ماسی دەبوو دوورا و دوور لێی بڕوانن، ئەوان نازانن ئەمان بێ دەریا ناژین، ئەوان چاکەکانی دەریا لەگەڵ خۆیان دەرک ناکەن، (نازانن بڕانی ئەوان لەدەریا مەرگی ئەوانە.)

ماسییە منداڵەکان تاهەنوکەش بەشەڕ هاتنی دەریا و بایان نەدیوە، ئەو شەڕەی دیوی دەرەوەی ڕازێکی قوڵترە، ڕازێک لەو ڕازنەی تیایاندا یەکیەتییەکی قوڵتر، ڕازێکی قوڵتر خۆی پیشان دەدا، تا دەگاتە قوڵترینی ڕازەکان کە ئەویش خودایە، خودا ڕازی ڕازەکانە، ئەگەر ڕازی خودا نەبێت ڕازەکانی دی هیچیان نابن، بەڵام ئەمە سەفەری ڕۆحی و عیرفانی دەوێت تا لێی تێبگەیت، ئەو ماسیە وردانەی هێشتا هەموو تواناکانی بینینی چاویان نەبڕیوە کەی دەگەنە ئاستی بینینەکانی

ڕۆح و (بەسیرەت)؟ شەڕی دەریا و با ئەوکاتەی با بەهەموو توانایەکیەوە خۆی بەدەریادا دەدا و دەریای هێمن و ئارام تورە دەکا و، شەپۆلەکان لە دەریاوە بلند دەبنەوە و بەرپەرچی هێرشەکانی با دەدەنەوە و بەمەرگی خۆیان دەریا دەپارێزن، ئەمانی ماسی ئاگایان لەو شەڕەیە و لە ترسا نزا دەکەن خودا لەشەڕی (باڕەش) دووریان بگرێت و بەدەم دوعاوە جەستەیان دەلەرزێ، خودا نزاکانی ئەمانی ماسی قبوڵ دەکا و ئەم بەشەڕهاتنەی دەریا و با کۆتایی دێت.

بەڵام با هەرگیز واز لەشەڕەکانی خۆی ناهێنێت، جارێک شەڕ کۆتایی دێت و جارێکی دی دەست پێدەکاتەوە، ئەمجارەیان با سوود لە تواناکانی مرۆڤ وەردەگرێت و بە هەناسەکانی پاڵ بە کەشتییەکانی مرۆڤەوە دەنێت و بۆ تالانی سامانەکانی دەریا بەرە و قوڵایی دەریا بەڕێیان دەکات.

ئەمانی ماسی چاویان ئەبڵەق دەبێت کاتێک دەبینن مرۆڤەکان و کەشتیە تەختەییە زەبەلاحەکانیان دێن و تۆڕەکانیان بۆ ناو جەرگی دەریا هەڵدەدەن و گەنجینەکانی ناو هەناوی دەریا دەماشنەوە، دواتر بە پاڵپشتی باو بە پشت بەستن بەهەناسەکانی ئەو بەرەو کەنار دەکشێنەوە، ئەوان دوای ئەوەی هەموو

سنوور و هاوسەنگیەکی دەریا تێکدەدەن دەکشێنەوە، دوای ئەوەی شێوازی دابەشبوونی گیانلەبەر و خۆراکی دەریا دەشێوێنن .

شەڕەکان هەمیشە بە قوتدانی بەشێک لە کەشتیەکانی مرۆڤ لە لایەن دەریا و قوتدانی هەندێک لە مرۆڤەکان و بوون بە خۆراکی ماسیەکانی دەریا کۆتایی دێت، پاشان دەریا هەرچی ئاماژەی شەڕ هەیە لە خۆی دەسڕێتەوە.

ئەو ماسیانەی چاویان بڕیوەتە جەستەی ئەم، ئەم باڵندانەیان نەبینیوە کە بەسواری (با) بەسەر دەریادا دەگەڕێن و بونەتە چاوی (با) و پەڕوباڵەکانیان دەکەنەوە و چاویان لە دوورەوە بریسکەی دێت و جارجار پەڕێکیان لێدەبێتەوە و بە جوڵەی باوە دەنیشنە سەر دەریا، ماسیەکان بەچاوی کراوەوە سەیریان دەکەن و هەڵمەتی بۆ دەبەن و ماسیەکان کە قەپۆز لەو (پەڕ)ە دەدەن سەریان لە نەرمیەکەی دەسوڕمێت، لە دیارترین سیفەتی پەڕی باڵندەکان نەرمیانە، ماسیە بچووکەکان نازانن (با) بە شتە ڕەقەکان ناوێرێ، بۆیە شتەکانی دەم (با) لە شتە سوکەڵە و نەرمەکانن (وەک پەڕی باڵندە و گەڵای درەخت)، تەنانەت ئەو دەمەش ڕەشەبا شێت دەبێت و دەیەوێت زەوی بکاتە وێرانە، مرۆڤ و گیاندارەکانی

قەت نەخەوتوو) قسەی مرۆڤەکان بوو، کە بۆ گەیاندنی زانیارییەکان بەیەکتر ڕوویان لە یەکتری دەکرد و تەنانەت ئەگەر ڕوویان لە یەکتریش نەبووبێت تەنیا بزواندنی بەشێک لە جەستەیان لەیەکدی حاڵی دەبوون، مرۆڤەکان وشەکانیان لە دەمیانەوە دەردەچێت و بەناو هەوادا بەخش دەبێت و بەگوێی ئەوانی دی دەگات، ئیدی لەیەکتر تێدەگەن، بەبێ ئەوەی ڕووی دەمیان لەیەکتر بێت، واتە مرۆڤەکان قسەکانیان بچووک و سوک و سۆڵ دروست کردووە، هێندە بچووک تەنانەت ئەمانی ماسی هەمیشە چاوکراوەش لەبری ئاوی جۆگە و لە پەنا بەردەکاندا نەیان بینن، هێندە بچووک کە بەکەمترین ئەرک بە (با) هەڵبگیرێن، واتە مرۆڤ زۆر ژیرانە سوودی لەتواناکانی (با) وەرگرتووە، ئەو بایەی بەدەم و لوت و گوێیاندا دەڕوات و لەناوی ناوەوەی مرۆڤ ماناکان بۆ دەرەوەی مرۆڤ هەڵدەگرێت.

ماسیە بچووکەکە ئەوەی دەزانی کە هەروەک چۆن مرۆڤ سوودی لە تواناکانی (با) وەرگرتووە ئەوانیش لەتواناکانی ئاو سوودمەند بوون، ئەوان (ماسیە وردەکان) نازانن مرۆڤ وتەکانی بێ کێش و سووکن، ئەمان نەرمی ئاو هاوکاریانە تا ماناکانی

خۆیان بگەیەنن، چونکە ئەم نەرم و بەخشندەیە و زۆر بەئاسانی بەنێو پەردە نەبینراوەکانی دا دێن و دەچن، لە هەمانکاتدا سوود لە جەستەی خۆیان وەردەگرن بۆئەوەی خێراتر ببزوێن، ڕێک بەوەندەی مرۆڤێک زمانی دەبزوێنێت بۆ ئەوەی گوتەیەکی بڵێت ئەمان جەستەیان هەموو جەستەیان لەنێو ئاودا بۆ گەیاندنی ماناکانیان دەبزوێنن، ئاو نەرم و ماسیش سافە، ئاسانی بزواندنی زمان و هەناسەی مرۆڤ بەرامبەر بە بزواندنی هەموو جەستەی ماسیە لەناو ئاودا. مرۆڤ زمانی گەیەنەری ماناکانە و ماسیش جەستەی زمانییەتی کەلەنێو ئاوەکەدا دەبزوێت، ئەوەش لەئارامی ئاوەوەیە کەبە لێبوردەییەوە خۆی لەگەڵ جوڵەی گیاندارەکانی ناو ڕۆحی خۆی دەگونجێنێت، ماسی بۆ ئەوەی قسەبکات لەنێو ئاودا هەموو جەستەی جوڵە دەکات، لەلایەکی دیکەوە بێ ڕەنگی ئاوەکە وایکردووە جوڵەی ماسیە قسەکەرەکە بەئاسانی لە لایەن چاوی هەمیشە کراوەی ماسیەکانی دیکەوە ببینرێت، ماسیەکان بەچاویان دەبیستن.

ماسیە گەورەکە بۆ دەربڕینی هەرکام لە وشەکانی کە دەیوست دەریان ببڕێت دەبوو هەموو لاشەی بجوڵێنێت، بەڵام ئەو کارەی بە خێرایی لەناو ئاوەکەدا ئەنجام ئەدا کە لە جوڵانی زمانی مرۆڤ

خێراتر دەکەوتەوە کەلەئەشکەوتی دەمی دەیبزوێنێت، مەگەر مارماسیەکان توانیبێتیان لەو خێراتر بەو کارە هەستن، ئەو پێویستی بەهەزاران هەزار جوڵە هەیە هەتا هەموو ئەزمونە نەبڕاوەکانی بۆ ماسیە وردەکان بگوازێتەوە.

ماسیە گەورەکە لەبەردەم پەنجا ماسی ورددا کە خەریکی مژینی ئاوی دەوریان و دانەوەی بە گوێچکەلەکانیان بوون بێ ئەوەی ئاو ببینن (ماسی ئاو نابینێت، بەڵام شتەکانی ناو ئاو دەبینێت) ماسیەکە بە بزواندنی جەستەی وتی: (ماسی بۆئەوەی فێربێت دەبێت ببینێت، دەبێت بەچاوەکانی سەیری هەموو ڕووداوەکان بکات، هەموو دەریا و ڕووبارەکان بگەڕێت) ئەو باوەڕی وایە ماسی بۆ ئەوەی باش بار بێت چەند شتێکی زۆر پێویستە (١- زۆر بینین.٢- خواردن، ٣- جوڵە). واتە فێرکردن تەنها بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەو شتانەیە کە پێشتر بینراون، ماسی لە شتێک تێناگات نەیبینیبێت، چونکە (بینین) و سەیرکردن بەچاوە کراوەکان یەکەمین و دوایەمین ئامرازی فێربوونی ماسیانە، ئەمە یەکێک لە حیکمەتەکانی ئاو و جیاوازیەکی جیهانی ئاوە لە جیهانی (خاک و با).

دەیوت: (ماسیان بۆ ئەوەی زیاتر فێربن دەبێت زۆرتر بگەڕێن) ماسیان بە پێچەوانەی مرۆڤەوە هەموو دەریا بە مەملەکەتی خۆیان دەزانن، (دەریا خۆراک بۆ هەموو ماسیان دابین دەکات و ناو سکی دەکاتە شوێنی کۆبوونەوەی گەراکانیان و لەدایک بوون و گەورەبوونیان، دەریا وەک کتێبێکی گەورەی کراوە جێگای زانیارییەکانە، کتێبێکی گەورە بەئەندازەی مەزنی دەریا، ماسی بۆ ئەوەی ئەو کتێبە بخوێنێتەوە دەبێت هەموو دەریا بگەڕێ.)

ئەوی پیرە ماسی نایەوێت دەریا و شتەکانی بۆ ئەوانی بچووک باس بکات (ئەمە کارێکی نەشیاوە)، بەڵام دەتوانێت بینراوەکانیان پێکەوە ببەستێتەوە پەیوەندییان پێکەوە پیشان بدات... هەموو مامۆستایەکی ماسی کاری ئەوەیە دوو شت بکات.

یەکەم: هەموو ئەو شتانەی بەبەرچاوی کراوەی ماسیەکاندا تێپەڕ دەبن بەچاویان سەیری بکەن.

دووەم: ڕێگای بینینی زیاتریان پیشان بدەن تا بەدەریای فراواندا بگەڕێن. دەریا هێندە فراوانە، ئەگەر ماسیان سەدان ئەوەندەی ئێستایان زۆرتر و گەورەتربن دووبارە هێشتا جێی هەموویان دەبێتەوە.

(خودایە!!! دەریای مەزن سەدان ئەوەندەی خاکی مرۆڤەکان فراوانە... دەریا بەقەد فراوانی ئاسمانی

مەملەکەتی ئەستێران، ئەو ئەستێرانەی پاش ڕۆیشتنی خۆر سەدان هەزاریان دێنە دەریاوە بۆ مەلەکردن و یاریکردن، ئەمانی ماسی بەچاوی شەو نەخەوتوو و کراوەوە سەیریان دەکەن...خودایە!! لەسەر ڕووی دەریا و ئەستێرە و ئاسمانەوە ئاگاداری جوڵە و فراوانی هەموو ئەوانەی.... چەندە مەزنی خودایە!!)

ئیدی ماسی مامۆستا و وانەکانی یەکەیەکە بۆ ماسیە وردەکان دەست پێکرد.

# جوڵان بەرەو خۆر

ناشێت هیچ ماسیەک لەبنی دەریادا ئەوکاتەی هێشتا زۆر بچووکە و تەنیا بە ڕۆبیانی ورد و قەوزەی سەر بەرد و لێواری دەریاکان دەژی، لەوە تێبگات لەسەر ڕووی دەریا چی دەگوزەرێت، باشترین ڕێگاش بۆ بینین سەرکەوتنە بۆ ئەوێ، بۆیە (ماسی حەکیم) بەیەک جوڵەی جەستەی ئاماژەی سەرکەوتنی بەهەموو ماسیەکان دا، ئەمەش وانەی یەکەم بوو، ئەگەر سەرکەوتن یەکەم وانەی فێربوونی مرۆڤ بێت، ئەوا (جوڵە) یەکەم شتە کە ماسی فێری دەبێت، ماسیە پیرەکە کاتی زۆر گونجاوی بۆ سەرکەوتن بەرەو ڕووی دەریا هەڵبژارد، چونکە هەنووکە ماسیە وردەکان زۆر لەوە وردترن بکەونە داوی تۆڕی مرۆڤە ڕاوچیەکان، هەروەها لەوەش بچووکترن کە باڵندەکان، ئەو باڵندانەی کەبە جیکە جیک و قیڕەیان نایەڵن ساتێک ئاسمانی سەر دەریا

ئارام بێت ببنە جێی تەماحیان تا بە دەنووکی تیژ و یەک دوو جار سەر لەقاندن قوتیان بدەن، ماسیە بەئەزموونەکە بڕیاریدا هەموو وانەکانی خۆی لەنزیک دەریاوە بەقوتابیەکانی بڵێ، کەیەکەمیشیان جولان و سەرکەوتن و جوڵانە بەرەو ڕووی دەریا بۆ بینینی خۆر.

ئەو دڵنیا بوو لەوەی ئەو ماسیانەی جوڵەیان بۆ چەند جێگەیەکی بچووکی بنی دەریا زیاتر نەبووە، لەڕووی دەریادا کاتێک تیشک و تینی گەرمای خۆریان بەردەکەوێت ئەو دەمە لە خۆشیاندا شاگەشکە دەبن، کاتێک ڕەنگەکانی دەرەوەی دەریا دەبینن ئەو ڕەنگانەی لەبنی دەریادا وێنەیان نییە، کاتێک جوڵەی کەشتیە زەبەلاحەکانی مرۆڤ دەبینن کەوەک شاخ بەسەر دەریادا دەجولێن، کاتێک ڕۆشنایی نووری شارەکانی کەناری دەریا دەبینن، چرا سور و سەوزەکان کەلە دورەوە دەبریسکێنەوە لەچاوی ئەمانی ماسیدا ئەوە دەبینن کە چۆن دەریا لەژێر ڕۆشنایی تیشکی خۆردا خۆی داوە بەسەر گۆی زەمیندا و ڕێگە بە خۆر دەدات بە پەنجە تیشکەکانی پشتی بخورێنێ، دەریا لەم پشت خوراندنەی لەلایەن خۆرەوە لەزەت دەبات، بۆیە دەریا لەڕۆژی دەرکەوتنی خۆردا تورە نابێت و شاخە

شەپۆلی لێ ناڕوێت، ئەو شەپۆلە هێمنانە دەردەکەون کەوەک دەماری پشتی دەریا وان و لەژێر خوراندنی پەنجەکانی خۆردا دەجوڵێن، دەریا لێی ڕاکشاوە و جوڵەی لەخۆی بڕیوە و نابزوێت، بۆیە لەڕۆژی خۆرەتاودا وردە ماسیەکان دەتوانن وردتر بڕواننە مامۆستا و جوڵەکانی و وانەکانیان بخوێنن، بەپێچەوانەوە کاتێک شاخە هەورەکان دەردەکەون دەریا شێتگیر دەبێت، ئەو دەمە دەشێت مامۆستا ماسیە وردەکان بەرەو توێژەکانی خوارتری دەریا ڕێنمویی بکات، ئەو لەوە دڵنیایە کە هەورەکان پەیامی شوێنە دوور دوورەکان دەگەیەننە دەریا، بەڵام سەری لەوە دەرناچێت بۆچی دەریا بە بینینیان توڕەو بێتاقەت ببێت.

هەورەکان پەیامی دەریا دورەکانن، هەواڵەکان دڵۆپ دڵۆپ دەڕژێننە دەریا و دەتوێنەوە، کە هەورەکان دێن، دەریا یەک تەکان دەکەوێتە وروژمدان و لەرزە و خۆ خواردنەوە، شەپۆلە تیژەکانی دێن بەیەکدا، ئەوسا ماسیەکان بەرەو سکی دەریا زیاتر دێنە خوارەوە، دەریا وەک دایکێکی بەسۆز ئەوانی ماسی لەسکی خۆیدا دەپارێزێت ناخی دەریا جیا لەدیوی دەرەوەی گەرم و هێمنە.

(خەسڵەتی یەکەمی ماسی کپی و ئارامیەتی، ئەم خەسڵەتەش لەئاوی دایکیەوە بۆی بەجێماوە، بۆیە شەڕە خوێناوی و بێ بەزەییەکانی گیاندارانی وشکانی لەهەناوی دەریادا جێیان نابێتەوە، دەریا دەرونی خۆی ناکاتە جێگەی هیچ پیسیەک، بۆیە دەریا لاکی مردووەکان فڕێدەداتە دەرەوەی خۆی، دەریا هەمیشە خەریکی پاککردنەوەی خۆی و ماسیەکانی ناویەتی.)

پیرە ماسی کاتێک پێش ماسیە وردەکان کەوتبوو و بەناو ئاوی دەریادا سەردەکەوت، ئاوی دەریا بۆ ئەمی دەریا دیدە وەک چەندین توێژ پەردەی ناسکی بێڕەنگ وابوو کە بە هەر جوڵەیەکی ئەوان پەردەیەکی دەدڕا، تەنیا ئەمیش هەستی پێ دەکرد، چونکە ئەم دەرەوەی دەریای بینیوە، بەڵام ماسیە وردەکان هەستیان بە بوونی ئاو و دەریا نەدەکرد، (بۆئەوەی لەئاو تێبگەیت دەبێت دەرەوەی دەریا ببینیت.)

ئاو زۆر ڕۆڵی گرنگ بۆ ئەوان دەبینێت، بۆنمونە ئەگەر مرۆڤ بە پێڵوە چاوە شوشەییەکانی دەپارێزرێت، ئەوا ماسی پێویستی بە پێڵوو داخستنی چاوەکانی نییە، چونکە بەردەوام ئاو چاوەکانی ماسی پاک دەکاتەوە بەبێ ئەوەی ئاو ببینێت، چونکە ئاوی بێ ڕەنگ هێندە ڕوونە قەد نابینرێت، ئاو ڕوونە هێندە

ڕوون بچووکترین شتی تێدا دەردەکەوێت و ماسی خێرا بەچاوی کراوەی دەیدۆزێتەوە و هەڵمەتی بۆ دەبات .

هەموو ئەوەی مرۆڤ دەیبیستێت، ماسی دەیبینێت، ئەوەش هەر نەک دەزگای وەرگرتنی ماسی کەم نەکردۆتەوە، بەڵکو دەریا هەموو بیستراوەکانیان بۆ دەکاتە بینراو، ئەوەش یەکێک لەچاکەکانی ئاوە لەگەڵ ماسیدا، بەڵام (ئاو) ڕەنگی نییە، هەروەها (با)ش وایە...

مامۆستا و ماسیە وردەکان بەرەو خۆر سەردەکەوتن، لەکاتی بڕینی ئاوی دەریادا مامۆستا پیرەکە بیری بۆلای بینینە سەرەتاییەکان گەڕایەوە، ئەو ساتانەی ئەمی ماسی لەکانیاوێکدا چاوی هەڵهێنا، کانیاوێک وەک چاوی ماسی هەمیشە ڕوون و کراوە، کانیاوێک سەدان شەو و ڕۆژ ڕێگا لە دەریاوە دوورە، کانیاوێک کە درەختە باڵا بەرزەکان ئەم دیو و ئەودیویان تەنیوە، کانیاوێک ئاوەکەی لەچاوی قرژاڵ ڕوونتر، کانیاوێک ئەمی ئەو دەمە وردو گزگل لەوێ درەختەکانی بەڕووتی و پۆشتەیی تێیدا بینی، ئەو دەمەی درەختەکان جلی سەوز لەبەردەکەن و گوڵ و نەخشی سورو و زەرد لەو جلانە دەدەن و بەهاتنی (با) درەختەکان قژیان بەردەدەنەوە و سەما

دەکەن، بەو جوڵەیەی دەرەختەکاندا ئەم هەستی بە بوونی (با) دەکرد، ئەم قەد گوێی لەدەنگی (با) نەبووە و هەواشی بۆن نەکردووە، ئەو بۆنەی با سەدان دەریا پێش خۆی دەدات و بەهۆی ئەو بۆنەوە گیانداران پێش هاتنی (با) خۆیان دەپێچنەوە و هەموو شتێک جوڵە لەخۆی دەبڕێت. درەختە وەستاوەکانیش بێ کۆڵدان هەوڵی وەستان لەبەردەم (با)دا دەدەن.

ئەم (با) نابینێ، بەڵام با یەک با نییە، باکان زۆرن هەروەک ئەم بەچاوی کراوەی خۆی دەیبینێ کە هەر بایە و کاتی دەرکەوتنی خۆی هەبوو، هەندێ (با) درەختەکان خۆشیان لێدەهات و بەدەمیەوە پێدەکەنین و لەگەڵیدا دەهاتن و دەچوون، هەندێک باش دانیان وەک ماسی قرشی گەورە جیڕ دەکردەوە و دەمیان بەدرەختەکاندا دەکرد و قرچە قرچ لاشەیان دەهاڕین.

ماسیەکە بیری لەتەمەن کردەوە و (تەمەن) نابینرێت، واتە شتێک نییە بیخەیتە بیلبیلەی چاوەوە و کەشفی بکەیت، بۆ بینینی تەمەن دەبێت بژیت، دەبێت زیاتر لە شتێک ببینیت، بۆئەوەی زیاتر شتێکیش ببینیت پێویستت بە کات هەیە کاتیش هەرگیز پێکەوە نایەت، ساتەکانی کات هەمیشە بەشوێن یەکەوەن، واتە دەبێت ساتی پێشوو تەواو بێت ئینجا ساتی دواتر پەیدا دەبێت، بۆئەوەی ساتەکانی دواتر ببینیت

دەبێت ئارامت هەبێت، بۆنی ئارامی تاکە جیاوازی ماسیە بەتەمەن و ماسیە وردەکانە، ماسیە وردەکان دەیانەوێت لەیەک ساتدا هەموو شتەکان بقۆزنەوە، بەڵام ماسیە پیرەکان ئەوانەی هاتنی ساتەکانی دواییان بینیوە، ئەو ساتانەی بۆ ئەمانی ماسی لەنێو ئاودا تواونەتەوە، دەزانن دەبێت ئارام بگرن تا (دەریا) حیکمەتەکانی خۆیان پێ پیشان بدات. ئەمەش تەنیا بەئارامگرتن دەبێت، بۆنموونە ئەو ماسیەی تەمەنی تەنیا ڕۆژێکە، ناتوانێت ئەو شتانە ببینێت کەلەماوەی هەفتەیەکدا ڕوودەدەن. ئەوەش تەمەنی هەفتەیەکە جیاوازیەکانی ڕۆژەکانی دەریا نازانێت، ئەوەش تەمەنی مانگێکە گۆڕانەکانی وەرزێک (دەرک) ناکات، ئەوەش سەراپا وەرزێک ژیاوە نازانێت وەرزەکانی دیکە چییان لەهەناویاندا بۆ بینین هەڵگرتووە، (ئەوەی تەنیا گەرمای هاوینی ئەزموون کردووە، سەرمای زستان و خەزانی پایز و جلی سەوزی بەهار ناناسێت.)

ئەو ماسیەی لەبەهاردا ژیاوە و لەژێر ئاوی ڕوونی کانییەکەوە سەیری باڵای سەوزی درەخت و ئاوخواردنەوە و کلکە لەقەی باڵندە ڕەنگا و ڕەنگەکانی کردووە. لە لەرزینی جەستەی رووتی ئەو درەختانە تێناگات کە لە سەرمادا هەردوو ئەژنۆیان

نوساندووە بەیەکەوە و هەردوو دەستیان و چنگیان هەلپێکاوە و بەفری سپی دەبێتە بەرگێک و دەکرێتە بەریان. زستان هەموو شتەکان مات دەبن تەنیا (با) نەبێت. زوو زوو پەلە هەورەکان دەهێنێت و هەڕەشە لە هەموو شتەکان دەکات و سوێن دەخوات ئەو بەستنەی بەستیان و بوون بە سەهۆڵ جارێکی دی بەری نادەن. (ئاو)یش بەبێ گوێدانە هەڕەشەکانی با تەنانەت ئەو دەمەش کە ڕووی جۆگەکانی پڕ لەبەفر دەبن، ئاو هەر خەریکی جوولەی خۆیەتی، (ئاو) دەزانێت (با) هەموو زستانێک ئەم هەڕەشەیەی دووبارە دەکاتەوە، بەڵام لەگەڵ هەڵهاتنی خۆری یەکەم ڕۆژی بەهاردا سەهۆڵەکان دەتوێنەوە و پاشان ون دەبن.

ماسیە بەهارییەکان ئەوانەی بەهار لەبن ئاوی کانیاوەکاندا لەگەراوە دەبنە ماسی، ئەو دەمەی زەردەخەنەی درەختەکان دەبینن، لەپەتای زەرد هەڵگەڕانی پایزی درەختەکان تێناگەن. (زەرد هەڵگەڕان)ی درەختەکان نەخۆشییەکی گشتگیرە، تەنانەت ڕووی خۆریش لەگەڵیان زەرد هەڵدەگەڕێت و نەخۆش دەکەوێت و پەتای ئەم نەخۆشیە هەموو درەختەکان دەگرێتەوە بێ بواردن، ئاخر درەختەکان ڕاست لەبەردەم تیشکەکانی خۆری نەخۆشدا

لەجەستەی زەوی چەقیون و پێکانیان هێندە ڕۆچوون بۆیان هەڵنابڕێت، تا لەبەردەم تیشکی میکرۆباوی خۆر هەڵبێن، ماسیە وردەکان کاتێک لە بنی ئاوی کانیاوەکانەوە ئەم زەرد هەڵگەڕانەی درەختەکان دەبینن، زیرە دەکەن و لەترسانا دەحەپەسێن بەتایبەتی کە دەبینین گەڵاکانیان یەکەیەکە تا دوا گەڵا واتە سەدان و ملیۆنان گەڵایان لێ دەوەرێت و درەختەکانیان تووکیان پێوە نامێنێت و پێستی ڕووت و پڕ لە درز و گرێ گرێیاویان دەردەکەوێت، ئەوانی ماسی سەیری درەختەکان دەکەن و باوەڕیان وایە جارێکی دیکە نابنەوە بە درەخت و دەگرین و دەگرین، بەڵام چاوی کراوەیان قەد فرمێسک نارێژێت چونکە فرمێسک ئاوە و ئاویش هەموو گیانی ئەوانی گرتووە .

ماسیە پیرەکان کپ لێی دادەنیشن و گرنگی بەو پەشێویەی ماسیە وردەکان نادەن، ئەوان دەزانن بۆ ئەوەی ماسیە وردەکان لەوە تێبگەن کەئەو نەخۆشیە پایزیەی درەختەکان نەخۆشیەکی کوشندە نییە، ئەو نەخۆشیەی سەر ڕووی زەوی پڕ لەگەڵای زەرد و وشکی ئەو درەختانە دەکات، ئەو گەڵایانەی تەنانەت ڕووی ئاوی جوڵاویش دادەپۆشن، نەخۆشی ڕووتبونەوە و وەرینی بەرگ و قژی درەختەکان و

وەستانی گەشەی گیانداران و درەختەکان بەهار کۆتایی دێت و سەرلەنوێ چاک دەبنەوە، بۆئەوەش دەبێت تا ئەو کاتە ئارام بن و ماسیە وردەکانیش ئەو سیحرەی ڕۆژگار بە چاوی خۆیان ببینن، تا ئەوکاتەش دەبێت بێدەنگ بن، ماسیە بە ئەزموونەکە هەموو ئەو شتانەی بۆ خۆی باس دەکرد (ئەوکاتەی بۆ سەرەوەی دەریا دەجولا)، چونکە دەیزانی ئەوەی چاو و جولە و ئاو و ساتەکان فێری ماسیە وردەکانی دەکەن ئەم ناتوانێت پێیان بگەیەنێت، ئەم دەبوو تەنیا بۆ زیاتر ڕێنموییان بکات، دەبێت زیاتر بجولێن و ببینن و ئارام بگرن تا ساتەکانی دواتر پەیدا دەبن و تا ئەو کاتەش کە دەرەوەی ئاو دەبینن، ئەوجا لە خۆتان و لە ئاو و یاساکانی ئاو تێدەگەن، بۆ ئەمەش دەبێت لە نێو ڕۆحی دەریادا بەرەو دەرەوەی دەریا بچن .

ئەوی پیرە ماسی ئەو کاتەی بیر هاتەوە مرۆڤ لوولەکانی خستە دەمی کانیاوەکەوە و نەیهێشت ئاوی کانی بە سەفەری ڕۆژانەی خۆی بەرەو دەریا بەردەوام بێت، ئەو دەمە ئەم تەمەنی سالێکی چوار وەرزە بوو، واتە هەموو گۆڕانە وەرزیەکانی ڕۆژگاری تاقی کردبوەوە، ئەو و ماسیەکانی دیکە بەرەو دەریا کشان، دوای ئەوەی چەندین جۆگە و

چەندین ڕووباری درێژیان بڕی ئەوجا گەشتنە دەریا.
ئەم ئەگەر بەجەستەش لەزۆربەی ماسیەکانی نێو دەریا بچووکتر بێت، بەڵام ئەگەر چاو تاکە ئامرازی فێربوونی ماسیان بێت ئەوا ئەمی ماسی لەوە دڵنیایە هیچ کام لەو ماسیە زەبەلاحانەی دەریا هەرگیز بەقەد ئەمیان نەبینیوە، لەم سەفەرە دوور و درێژەی نێوان کانی زێدی و دەریادا کەسەدان جار مانگ و ئەستێرەکان جێگەی خۆیان گۆڕی، هەزاران گیانداری توکنی بینیوە کەچاویان بریسکەیان هاتووە، سەدان شاری ئاوەدانی مرۆڤی کەنار ڕووبارەکانی بینیوە، ئەو کاتانەش ئەم بینراوانەی بەچاوی ماسیانەی تەماشاکردووە، بەردەوام خەریکی ڕێبڕینی خۆی بووە، بەنێو سەدان تۆڕی مرۆڤە ڕاوچیە نیوە ڕووت و نیوە پۆشتەکاندا تێپەڕیوە.
لەهەموو ئەمانەشدا قەدەر جەستەی بچووکی ئەمانی پاراستووە، ئەم بەنێو جیهانی مرۆڤدا سەدان شەو و ڕۆژ هاتووە، مرۆڤ ئەو گیاندارە سەیرەی سەر ڕووی زەوی، کە سەدان گیانداری لەو گەورەتر هەیە بۆ نموونە، فیل (ئەوان لوتیان لە ڕووبارەکان دەژەنن بۆئەوەی ئاو بخۆنەوە) بەڵام مرۆڤ سەدان شتی لە خۆی گەورەتر دروست کردووە، (دروستکردن!!!) ئەو جوڵەیەی کە هەموو ماسیانی

دەریا مانای نازانن، کەبەهۆیەوە مرۆڤ ئەو ئاژەڵانە و گەورەترین شتەکانی بوون (واتە شاخ و دەریا و با) کانی خستۆتە ژێر ڕکێفی خۆی (چاکتر وایە بوترێت سوودی لە پەیوەندی و دژایەتیەکانی ئەو شتانە بینیوە، بۆ نموونە مرۆڤ شەڕەکانی با و دەریای بە قازانجی خۆی بەکارهێناوە، شاخ و بەردەکانی لە دژی ڕەشەبا کردۆتە پەناگا، مرۆڤ ئەو گیاندارە زۆر بزێو و شەیتانەی تەنانەت مەرگیش ڕێی کارکردنی لێناگرێت، ئاخر گەلێ جار ئەم بەچاوی ماسیانەی خۆی بینیوەتی مرۆڤەکان دەبوونە خۆراکی ئاژەڵ، یان دەبوون بەژێر ئامێرە دروستکراوەکانی خۆیانەوە، لەهەمووی سەیرتر ئەوەبوو مرۆڤەکان بێ ئەوەی یەکتر بخۆن شەڕیان بەرامبەر یەکتر دەکرد و خوێنی یەکتریان دەڕشتە ئاوەوە، بینینی خوێنی مرۆڤ لەناو ئاودا بۆ ئەمانی ماسی گەلێ سامناک بوو، ئەو خوێنەی ڕەنگی ڕووباری دەگۆڕی، ئەمان گەلێ جار مرۆڤیان بینیوە کە خوێنی گیاندارانی لەنێو ئاودا شۆردۆتەوە، بەڵام هەرگیز ئەو خوێنانە بەوێنەی خوێنی مرۆڤ سامناک نەبوون.

مرۆڤ گیاندارێکە لە هەموو گیانداران زۆرتر دەکوژێت و خوێن دەڕێژێت و دەتوانێت شت دروست

بکات و تەنانەت بە گژ دەریا و باشدا بچێتەوە و لە هەمووی گرنگتر ئاگر بکاتەوە، ئەو ئاگرەی ئەمی ماسی کاتێک بۆ یەکەم جار بینی لەترساندا پێچێکی خێرای بەجەستەی دا و پشتی تێکرد... (ئاگر!!) ئەی خوایە گیان (ئاگر) لەنێو دەریادا وێنەی نییە، بۆیە هیچ ماسیەکی قولایی دەریا لێی تێناگات، تەنیا ئەو ماسیە کۆچەرانە نەبێت کەلە ڕووبار و کانییە زۆر دوورەکان لە دەریاوە هاتوون، ئەو ماسیانەی مرۆڤیان بینیوە ئاگری کردۆتەوە و تاریکی شەوی پێ ڕۆشن کردۆتەوە و ماسی پێدەبرژێنێت، بەڵام ئەم نازانێت ماسی برژاو تامی چۆنە چونکە شتە برژاوەکان تایبەت بە مرۆڤن مرۆڤ بەئاگر زۆر لە دوژمنەکانی دەبەزێنێت، بۆ نموونە تاریکیەکانی پێ ڕۆشن دەکاتەوە و خانووە ساردەکانیش گەرم دەکاتەوە، ئیدی ئەم ڕووناکی و گەرمایە لەبنی دەریادا بوونیان نییە. یەکێکی دیکە لەتواناکانی مرۆڤ (هەڵگرتنە، واتە مرۆڤ دەتوانێت شتەکانی هاوین بۆ زستان هەڵبگرێت، هەروەها لە هاوینیشدا بابەتی زستان دەخوات، ئەمەش لەبنی دەریادا و لای ماسی بوونی نییە.

کوشتن، ئاگر، کار، هەڵگرتن تواناکانی جیهانی خاک و مرۆڤن، بەڵام ئەمە مانای وانییە بەهۆی ئەو

شتانەوە جیهانی خاک و هەوا لە جیهانی ئاو و دەریا ئاسوودەترن، بگرە زۆرجار بوونیان وێرانی و لەناوبردنی بیمانایان لێ کەوتۆتەوە، نەبوونیشیان لە دەریا نەک هەر لە ڕێساکانی دەریای کەم نەکردۆتەوە، بەڵکو گەلێ کاملتر و وردترن، ئەوەش ئەو حیکمەتەیە کە ئەمی ماسی پیری حەکیم پێی گەیشتووە، پیری تەمەن درێژی شایەتی گۆڕانەکانی ڕۆژگار، پیری بەجەستەی بچووک چونکە خوای گەورە جەستەی بۆ کانیاوێکی بچووک دروست کردبوو، نەک بۆ دەریای فراوانی ئەوپەڕ نادیار (خۆبینین بەچاوی ماسی و ژیری پەیوەندیان بە جەستەوە نییە.)

ئەوی حەکیم دەیوت: (ئەو دەمەی ماسیە وردەکان جیهانی سەر دەریا دەبینن، سەریان دەسوڕمێ و ئاوات دەخوازن بگەنە ئەو جیهانە وەک ئەوەی ئەمی ورد زوو دەیخواست. ئەوسا لەو سەرکەشیەیان پەشیمان دەبنەوە و ئارام دەبنەوە و دەچنەوە نێو ڕۆحی خۆیان بەوێنەی دەریا کپ دەبن و دێنەوە قوڵایی دەریا چونکەماڵی هەموو ئەوان دەریایە.)

ماسیە گەورەکە و ماسیە وردەکان بەرەو سەرەوەی دەریا سەردەکەوتن، کاتێک بەچاوی

کراوەیان تیشکی خۆریان بینی کە ئاوی دەریا بەرەو قوڵایی دەبڕی، سەرەتا لەنێو ئاوەکەدا خۆر کاڵ دیار بوو، بەڵام لەگەڵ سەرکەوتنی ئەماندا ئەویش تۆختر دەبوو، تائەو کاتەی توێژێکی زۆر تەنکی دەریا بەسەر سەریانەوە بوو. ئیدی ئەو حاڵە دەستی پێکرد کە ماسیە پیرەکە چاوەڕوان بوو ماسیە وردەکانی توشی ببن، ئەویش حاڵەتی ئەبلەقبوون و مەدهۆشبوون بوو... هەموو ماسیەکان حاڵەتێکی دێوانە ئاسا گرتنی، ئەوان باوەڕیان بەچاوی کراوەی خۆیان نەدەکرد، ئەوان جیهانی دەرەوەی دەریایان بینی، ئەوان دەریایان بینی، ئاویان بینی، خۆریان بینی، لەگەڵ (خۆر) دا هەڵدەپژانەوە و دەهاتن و دەچوون .

(ئاویان) بینی، ئاخر ماسی لەبنی دەریادا (ئاو) نابینێت!! نازانێت ئەوە ئاوە ئەو دەبزوێنێت، نازانێت دەریا باش لە جووڵە و زمانی ئەو حاڵیە، خودا ئەوی خوڵقاندووە کە لەگەڵ ئاودا بێتەوە و بەئاسانی ببزوێت و جەستەی مەزنی دەریا ببێتە نیشتیمانی. نیشتیمانێک لەنێو ماسیاندا بەش نەکراوە. دەریا هی هەموو ماسیەکانە، سکی گەورەی دەریا جێی خۆراکی هەموویانە.

لەناو دەریادا (ئاو) بەجەستەی ساف و چاوی کراوەی ماسیانەوە نوساوە دووری نێوان ئەوانی ماسی و (ئاو) تەنیا خۆیانن، ئەوان ئاو نابینن بەچاوە هەمیشە کراوە و نەنوستوەکانیان. ئەوەش لەبەر نزیکی و پەیوەندی ئەوان و ئاوە... ئاو..(ئاو نابینن)، بەلام ئەگەر شتێک تەنانەت بلقی هەواش لەدەریادا پەیدا ببێت ئەوان هەلمەتی بۆ دەبەن، ماسیان نازانن ئەوە ئاوە بوار بەوان دەدات کەسەر بکەون بەرەو کەنار و لەوێش دوور بکەونەوە... ئاو بەشەپۆلەکانی سەدان فرسەخ بەرەو قولاییان فڕێدەدات، لەکاتێکدا ئەوان لە سینگی شەپۆلێکدا خەریکی جولەی خۆیانن، شەپۆل دەجولێ و ئەوانیش لەنێو شەپۆلدا دەبزوێن.

دونیا لەسەر ڕووی دەریا وەک بنی دەریا نییە، لێرە دەریا هەیە، شەپۆل هەیە، ڕەنگەکان، نوور، خۆر، پولەکەی سەوز و شین و زیوینی ماسی، پەڕی ڕەنگاو ڕەنگی باڵندەکان، ماسیەکان هەستیان بەفراوانی جیهانی بینراویان دەکرد تەنانەت لە دەریاش فراوانتر... ئەو دەریایەی کە نابڕێتەوە...

ماسیە پیرەکە بەچاوی کراوەی خۆی ماسیە وردەکانی دەبینی کەبەرەو دوا توێژی دەریا بەخێرایی دەجولان و فرتەیان دەکرد، جەستەیان لە ئاویش دەبڕی و لەسەر ڕوی دەریا خۆیان دەبینی و

پاشان تەقەلاکانیان بۆ گەیشتنە خۆر بێ ئەنجام دەبوو و دەکەوتنەوە دەریا، شێتانە ئەم کارەیان چەند جار دووبارە دەکردەوە تا ئەو کاتەی چاویان بێزار دەبوو و هەستیان بە گڕگرتن و سوتان دەکرد و چاویان دەبڕیە خۆر، سەیرترین شتی بینراو لای ماسیەکان سێبەری خۆیان بوو، ئەو سێبەرەی قەد لێیان جودا نەدەبووەوە و ڕاست لە ژێر ئەمان و لەنێو ئاوەکەدا لەسەر شێوازی جوڵەی ئەمان ئەویش دەجوڵا.

که ماسیە وردەکان دەهاتن و دەچوون بەراوردیان لەنێوان شینی ئاسمان و سپیەتی دەریادا دەکرد، ئاسمانیان وەک دەریایەکی دیکە دەبینی کە خۆر بەناوەڕاستیەوە نووساوە ماسیەکان تەکانیان دەدا و لە ئاو دەبڕان، دەیانویست لەم دەریاوە بۆ دەریای ئاسمان بفڕن، بەڵام پاش کەمێک مەلەکردن لەئاسماندا دووبارە دەکەوتنەوە دەریا... ماسیەکان لەم گەشتەیاندا هێندە شتیان بینی کەلە هەموو تەمەنیاندا ئەوەندەیان نەبینیبوو، ماسیە گەورەکە باش لەو شێوازە حاڵی بوو بوو کەلە ماسیە حەکیمە پێشینەکانەوە بۆی بەجێمابوو کەئەویش ئەوەبوو (هەر ماسیەکی مامۆستا کاری ئەوە نییە شتەکان بۆ ماسیەکان باس بکات، بەڵکو دەبێت هەوڵ بدات

هەرچی زورترە ببینن، هەرچی زۆرترە بجولێن، عەقڵی ماسی لە جولەدا گەورە دەبێت، دەبێت بجولێن، جا ئەوە دەریایە ئەوان دەجولێنێت یاخود ئەوانن ئاو و دەریا دەجولێنن و بەدەمیان دەیمژن و بەگوێچکەکانیان دەیکەنە دەرێ.)...

ماسیە وردەکان دەبزوان و ئارامیان نەدەگرت، لەکاتێکدا ئەمە چەند ساتێکی ڕۆژ بوو کە گەیشتبوونە رووی دەریا و پێش ئەوەی شەو بێت و لەگەڵ خۆی ئەستێرەکان و مانگ لە دوورەوە بهێنێت و لەئارامی شەودا بچنە دەریاوە و لەژێر توێژێکی تەنکی دەریاوە بەچاوی خۆیان ئەمانی ماسی سەیری یاری و مەلەکردنیان بکەن.

ماسیە گەورەکە لە دڵی خۆیدا دەیوت (ئەی خودا!!!) چەند مەزنی کە ئەو هەموو مەخلوقەت دروستکردووە، ئەی خودا!! چاوی کراوەی ئێمە، جوڵەی قەد نەوەستاوی هەموو تەمەنی ئێمەش ناتوانێت دەرکی مەزنی تۆ بکات، بەڵام بەچاوی دڵ لە ژێری ژێرەوە لەژێر ئەو هەموو شتانەدا لەبنی دەریاوە لە نوێژێکدا هەست بە بوونی تۆی مەزن دەکەین ئەی خودایە!! کە نوێژ دەکەین و بەسەر قەوزە و لەبنی دەریادا ئارام ئارام دەبزوێین، بیرلە تۆ دەکەینەوە و لەژێر دەریا و لەسەر ڕووی با و خۆر

و ئەستێرە و ئاسماندا هەست بە بوونی تۆ دەکەین، چەند مەزنیت کە دەریای فراوانت کردوەتە نیشتیمانی ئێمە... خودایە.!!!

# بەرەو کەنار

ماسیە پیرەکە نەدەبوو باسی کەنار دەریا و جیهانی مرۆڤ بۆ ماسیە وردەکان بکات، کە ئەوان دوای بێئومێد بوونیان لە چوون بۆلای خۆر و دەریای ئاسمان ئارام بونەوە و چاویان لە جوڵەی ئەمی مامۆستایان بڕیبوو، (ئەوی ماسی مامۆستا دەبوو ماسیەکان فێری ژیان بکات نەوەک چیرۆکی ژیانیان بۆ بگێڕێتەوە) بۆ ئەمەش دەبوو بەچاوی خۆیان ببینن.

ئەم بەیانییە، هەموو ماسیە وردەکان ئەوانەی بە درێژایی شەو بێزار بوون سەیری ئەستێرەکان و گڵۆپە ڕەنگاوڕەنگەکانی کەناریان دەکرد، ئەوان نەیاندەتوانی بەرەو ئاسمان بفڕن، بۆیە بڕیارياندا بەرەو کەنار ببزوێن، لێرەدا بوو پێشبینی ماسیە پیرەکە ڕاست دەرچوو کە ئەو لای وابوو (تەنیا ئەو ماسیە وردانە نین ئاوا ڕەفتار دەکەن، بەڵکو هەموو

گیاندارێک کاتێک هەست بە بوونی جیهانێکی جیاواز لە جیهانی خۆی دەکات دەیەوێت کەشفی بکات، بۆیە ماسیە حەکیمەکە لە هەستی ئەو ماسیە وردانە دەگەیشت کە بۆ کەنار و جیهانی مرۆڤ دەڕۆیشتن، ئەو جیهانەی بۆ ئەمانی بچووک بێگرفت نییە، بەڵام ماسیە پیرەکە دەیزانی وردی ئەو ماسیانە گرەنتی مانەوەیانە و دەریاش خۆراک بەخش و خوداش پارێزەریانە.)

ئەم بەیانییە لەگەڵ کازیوەی بەرەبەیاندا ئەو دەمەی ئەستێرە بەجێماوەکان خێرا خۆدەپێچنەوە بۆئەوەی فریای تاریکی بکەون، لەوێ جەستەی نوورینیان پیشان بدەن و پاشان لەچاو ون ببن، ئەو دەمە ماسیە وردەکان چاوی ڕێزیان بڕیە مامۆستای پیریان و بەرەو کەنار کەوتنە ڕێ.

ئەو دەمەی ماسیە بچووکەکە گەڕایەوە، تەمەنی خۆی لەقەرەی پازدە پایز دەدا، ڕاست ئەو کاتەی ماسیە مامۆستاکە زۆر پیر بوو بوو، بەڵام جەستەی بەئاسانی دەجوڵاو لەمەشدا ئاو هاوکاری دەکرد، بەڵام لەگەڵ پیر بونیشیدا زەینی ڕونتر بوو و شەفافتریش شتەکانی دەبینی و ژمارەی شتە بینراوەکانیشی لەلا زۆرتر دەبوو، تا ئەوەی بەتەنیا ئاماژەیەکی جەستەی ماسیەکانی دیکە تێدەگەیشت،

ئەگەر چی بەجەستە لە زۆرێک لە ماسیەکانی دەریا بچووکتر بوو، بەڵام لە زۆربەیان بە حیکمەت تر بوو ئەمەش لە سۆنگەی ئەوەوە بوو کە لەهەموویان زیاتر شتی بینیوە. ئەو هەمیشە دەیوت: (هەموو ماسیەکی مامۆستا تا بتوانێت مامۆستابێت دەبێت سەفەرێکی تولانی کردبێت، دەبێت دەریای بڕی بێت بەرەو کەنار و جیهانی مرۆڤ و لە مرۆڤ و یاساکانی تێگەیشتبێت، ئەمەش تەنیا ڕێگەی تێەیشتنە لە دەریا و یاساکانی.)...

دەیگوت: (ئەگەرچی پڕ لە ترس و سامناکە، بەڵام دواجار تەنیا ڕێگەی فێربوون ڕۆیشتنە... ئەو ماسیەی زۆرتر بڕوات زۆرتر دەبینێت، ئەوەش زانینی زۆرتر بوو ڕوحی گەورەتر و ئارامتر دەبێت، ئەوەش ئارام بوو دەتوانێت گوێ لە ڕوحی دەریا بگرێت و حیکمەت لە ئاوەوە فێربێت، ئێستا ئەو ماسیە وردیلەیەی پازدە هاوین لەوەو پێش خواحافیزی لێکرد، ئەمە پانزە نیوەڕۆی ڕەبەقە خۆر لە دەریادا مەلە دەکات و دەڕوات و ئەمی تازە گەڕاوەش جەستەی دەجوڵێنێت و هەموو ماسیە پیر و حەکیمەکان بەچاوی کراوەیان سەیری دەکەن، ئەمە پانزە شەوە مانگ و ئەستێرەکان دێنە دەریا و پێدەکەنن و مەلە دەکەن و ئەمیش بێ لەحزەیەک سرەوتن دەبزوێ و کۆمەڵی

ماسیە پیرەکان بێ ئەوەی یەک ماسی وردیان لەئاودا بێت، سەیری دەکەن و بە ڕۆحی بەرز و ئارامەوە گوێ لە قسەکانی دەگرن، بەراوردی ژیانی ئێستەی مرۆڤیان لەگەڵ ئەوکاتەی کە لە تەنیا گەشتی یەکجار و تولانی خۆیاندا بینیویانە دەکرد، ئەگەرچی بێئەوەی بەیەکتربلێن لە دڵی خۆیاندا هەموویان دەیانوت: (بنەماکانی ئەو ژیانە هەروەکو خۆی ماوە) مانەوەی ئەم بنەمایانەش مایەی جیاوازی جیهانی خاک و مرۆڤ و جیهانی ئاو و دەریایە، ئەگەرچی ژیانی مرۆڤ ئاڵۆزتر و وردتر بووە، ژمارەی مرۆڤەکان ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو زیادبوون دەڕوات، هێندە زۆر بوون کەنەک خاک بەڵکو هەموو دەریاکانیش نایانگرێت، هێندە زۆر کە ئەگەر وەک ماسی بێدەنگ و ئارام و وەک ماسیش بێ جەنگە بە کۆمەڵەکان بژین و وەک ماسی هەموو دەریاش ماڵیان بوایە و دەریاش خاڵی بوایە لە کۆشک و دەربارە گەورەکانیان، وەک ماسیش لە بزواندا خێرا بونایە و ئاویش هاوکاریان بوایە هێشتا هەموو دەریاکان جێی ئەوانی تێدا نەدەبووەوە... مرۆڤ هەر زۆر دەبێت و ماسیش هەر کەم دەکات.

ماسیە وردەکەی پانزە ساڵ لەوەو پێش، ئێستا لە دوای ئەوەی زۆربەی مەقامەکانی بینین و ئەزموونی

بینی بوو، لەبەردەم کۆمەڵێ ماسی لەخۆی ژێرتردا
ڕووداوەکانی بە بزواندنی جەستەی دەگێڕایەوە و
شیتەڵکردنی ڕووداوەکانی بۆ ئەوان بەجێ دەهێشت.

ماسیە بچووکەکە هەزاران فرسەخ دوور لە
مرۆڤ و جیهانی ئەوەوە لە قوڵایی دەریادا، ئەو
ماسیەی بەقەد پێیەکی مرۆڤ لەبنی دەریادا جارجار
لەکاتی جوڵانیدا سنگی لە وردە بەرد و لمی دەریا
دەخشاند، چیرۆکی پانزەساڵ بینین و جوڵانی بۆ
ماسیە پیرە حەکیمەکان دەگێڕایەوە.

# جیهانی مرۆڤ

ماسیە گەڕاوەکە بە بادانی جەستەی لەنێو دەریادا دەیوت: (ئێمەی ماسی، دەریا ماڵی هەموومانە لەکاتێکدا مرۆڤەکان هەرکەسە و ماڵی تایبەت بەخۆی هەیە)، ئەو پانزە ڕۆژی تەواو بوو سەفەری پانزە ساڵی کۆتایی پێهێنابوو، پانزە ساڵ لە جیهانی مرۆڤ ژیابوو... ئەو وەک هەرماسیەکی پانزە ساڵە جەستەی گەورە نەبوو بوو، چونکە ئەگەر وابوایە زۆر دەمێک بوو مرۆڤ ئەوی بەئاگر برژاندبوو، تەنیا ئەو ماسیانە دەبنە (مامۆستا) کە جەستەیان لەگەڵ تەمەنیان ڕاست نایەتەوە، واتە ئەو دەمەی لە جیهانی مرۆڤدا ژیاون مرۆڤ تەماعی خواردنیانی نەبووە، لە جیهانی مرۆڤدا ئەو ماسیانە چانسی مانەوە و تەماشاکردنی ورد و درشتی ژیانی مرۆڤیان بەچاوی هەمیشە کراوەی خۆیان هەیە کە وردن و داپۆشراو بە پولەکەی ڕازاوەن، ئەوانەی لە کوپەیەکی شوشەی پڕ ئاودا، لەنێو خانوەکاندا دایاندەنێن بێئەوەی هیچ حسێبێک بۆ

بینینەکانیان بکەن، بێئەوەی بیر لەچاوی هەمیشە کراوە و نەنوستووی ئەوان بکەنەوە، ماسیەکان لەنێو حەوزە شوشەکاندا تەنانەت ئەو دەمانەی کە مرۆڤەکانیش دەنوون، سەرنجی جیهانی سەمەرەی مرۆڤ دەدەن.

شەوان ئەو دەمەی مرۆڤ چاوی لێک دەنێت پەیوەندی ناوەوەی خۆی لەگەڵ دەرەوەی خۆی دەبڕێت، چاوەکانی مرۆڤ کە دوو دەرگان و بینراوەکان لێیانەوە دەچنە ژوورەوە بە داخستنی ئەو دوو دەرگایە ئەو دوو دنیایە لێک دەپچڕێن، مرۆڤ شەوان تەنیا ناوەوەی خۆی بە داخستنی چاوەکانی تاریک ناکات بەڵکو ئەو دەیەوێت لەگەڵ نوستنی ئەودا هەموو شتەکانی تریش بنوون، بۆیە هەموو چرا و گڵۆپەکان دەکوژێنێتەوە، بەڵام ماسیەکان ئەو دەمانەش هەر دەڕوانن، تەنها ساتێکیش نانون و سەیری ئەستێرە و نهێنییەکانی شەو دەکەن... ماسیان وانەکانی شەو وەک وانەکانی ڕۆژ فێردەبن، واتە لە بێدەنگی شەو وەک جووڵەی ڕۆژ بۆ ڕوانین (واتە، بۆ فێربوون) سوود دەبەن. لێرەوە ئەگەر تەمەنی ماسی نیوەی تەمەنی مرۆڤیش بێت ئەوا تەمەنی بەقەد تەمەنی مرۆڤە، مرۆڤ نیوەی تەمەنی بە داخستنی چاوی بێ ڕوانین بەسەر دەبات، ئەوی پانزە ساڵ

لەگەڵ سەختیەکانی جیهانی مرۆڤ ژیابوو و ئەزموونی وەرگرتبوو، لەبەردەم ماسیە حەکیمەکاندا واتە هەموو ئەو ماسیانەی وەکو ئەم سەفەریان تەدارەک دیبوو و ئەنجام دابوو، ئەوانەی تەمەنی هیچ کامیان لە (سی) ساڵ کەمتر نەبوو و لە (سی) ساڵیەوە تا هەزاران ساڵ و لەهەموو تەمەنەکان، تەمەنی پڕ لە حیکمەت و ئارامی، هەموویان چاویان بڕیبووە قسەکانی ئەمی گەڕاوە.

بەجۆرێک بەڕێز و حورمەتەوە پۆل پۆل لە دوورەوە وەستابوون، تازیاتر بواری قسەکردن و بزواندنی جەستە بۆ ئەم برەخسێنن، تا لە گۆڕانکاریەکانی جیهانی مرۆڤیان بۆ باس بکات، ئەگەرچی ئەوان (هەموو ماسیە حەکیمەکان) لەسەر ئەوە کۆک بوون هیچ کام لە گۆڕانکاریەکانی مرۆڤ هێندە جەوهەری نین کە مرۆڤ بگۆڕن، ئەمەش گەورەترین حیکمەت بوو کەلە هەموو سەفەرە پێشینییەکانی ئەو ماسیانەدا بۆ جیهانی مرۆڤ هەمیشە ڕاستی خۆی سەلماندبوو، ڕەنگە ئەوەش گەورەترین جیاوازی نێوان جیهانی ماسی و جیهانی مرۆڤ بێت... (ئەوان لەوە گەیشتوون ئەوە مرۆڤە هەموو شتەکان دەگۆڕێ، بەڵام خۆی هەر بە جێگیری دەمێنێتەوە).. مرۆڤ نەک ڕووی زەوی، بەڵکو هەناو

و جەرگی زەویشی گۆڕیوە، بەڵام خۆی نەگۆڕاوە (بەهەموو خراپی و چاکەکانییەوە)، لەکاتێکدا ماسی بۆ ئەوەی فێر بێت دەبێت دەریا وەک خۆی بێت و ئەم بگۆڕێت.. ماسی بۆئەوەی حیکمەتەکانی ئاو فێر بێت دەبێت بەبەردەوامی بەدەریادا بگەڕێت و گەورەبێت.. ماسی تا زیاتر بگەڕێت زۆرتر دەبینێت تا زۆرتریش ببینێت حیکمەتی زۆرتر فێردەبێت و لەئاودا دەتوێتەوە و گوێی لە دەنگی ئاو دەبێت، کە بەزمانی کپ و بێدەنگ خۆی وانەکانی فێردەکات، لەدەریادا مەزنی ڕۆح و مەزنی جەستە پێکەوەن، ئەو نەهەنگانەی بەقەد شارێک یاخود کەشتیەکی گەورەی مرۆڤ دەبن، بەقەد مەزنی جەستەیان ڕۆحیان گەورەیە، ئەمەش بە ئەزموون و بینینی جێگە لەیەک دوورەکانی دەریای گەورە، هەر بۆیە لەو مەزنییەش هەرگیز لەدەریا یاخی نابن.

ئێستا دوای ئەوەی پانزە ڕۆژ وازیان لێهێنابوو تا لەگەڵ دەریادا وێک بێتەوە و بتوانێت هەمیشە و بەردەوام لەگەڵ مژینی ئاوی نەبینراوادا گوێی لەدەنگی کپ و نەبیستراوی دەریا بێت و لەژێر کاریگەری جیهانی مرۆڤ و شێواویەکانی و یاساکانی ئەو جیهانەدا دەربچێت و ڕۆحی پاک وەک ئاوی لێبێتەوە.

دەیوت: (یاساکانی مرۆڤ زۆر جودان لەیاساکانی دەریا.. لە جیهانی مرۆڤدا هەموو شتەکان لەژێر فەرمانی ئەودان و بەو ڕێژە و ئەندازەیەش بوونیان هەیە کە مرۆڤ دەیەوێت تەنانەت زەوی و خاک بەو فراوانییە لەژێر پێی مرۆڤدان. لەکاتێکدا دەریا هەموو شتەکانی لەنێو خۆیدا قووت داوە) ئەم بۆ ئەم جیهانە سەیرە سەفەری کردبوو.. ئەو سەفەرەی بۆ ئەوەی هەماسیەک نازناوی (حەکیم)ی پێببەخشرێت دەبێت بیکات... ئەو سەفەرەی هەزاران ماسی لەبنی دەریاوە بەرەو ڕووی دەریا و لەوێشەوە لەژێر گەرمای تیشکی خۆر و تۆخی ڕەنگەکانی سەرەوەی دەریادا دەیکەن و تەنیا چەند دانەیەکیان دەگەڕێنەوە دەریا و دەبنە حەکیم و مامۆستای ماسیە بچووکەکان و وانەکانی (جوڵان و بینینیان) فێر دەکەن، تەنیا ئاماژەی سەرکەوتنیش لەو سەفەرەدا هەر ئەو ڕۆژە دەردەکەوێت کە دەگەڕێتەوە دەریا، دوای ئەوەی بەناو چەندین گرفت لەناو کوپە شووشەکان و لەنێو پەنجەکانی مرۆڤداماڵەو ماڵ بەجیهانی مرۆڤدا گەڕاوە، سەفەرێکی پڕ مەترسی وا کەتەنیا لە بیرو بۆچوونێکی یەکجاری مرۆڤ و نەگۆڕینی ئاوی شوشەکان بەسە بۆئەوەی بکەونە پرتە پرت کردن و جوڵە و، ئیدی گیانیان، لاشەیان بەچاوی کراوەوە بە

جێبهێڵێت، یاخود مرۆڤێکی تووڕە شووشەکە بشکێنێت و ئیدی بکەونە زەوی و ڕۆحی لەدەریا پەروەردەبوویان بەخاک بسپێرن، یان تەنیا لە خانوویەکی چۆڵدا بەجێیان بهێڵن و بێ گۆڕینی ئاوەکەیان بمرن و بکەونە سەر ئاو.

ماسیە گەڕاوەکە بۆ ئەوەی ئارامی خۆی وەربگرێتەوە و لەگەڵ دەریادا ئاوێتە بێت و جووڵەی جەستەی و ڕووگەی ڕۆحی لەگەڵ دەریادا بێتەوە، چەند ڕۆژ لەدوای گەڕانەوەی بەتەنیایی و تێرامان مایەوە، ئەو لەکاتێکدا دەیویست بەنرخی ئەزمونەکانی پێشانبدات و لەهەمان کاتدا خۆی لەوتنەوەی زانراوە پێشینەکان بەدوور بگرێت و قوڵایی بەو زانراوانە ببەخشێت وتی: (بەڕێزان وەک هەموو گەشتە پێشینەکان هەستی بوونی جیهانی جیاواز ئێمەی بۆلای خۆی ڕاکێشا، جیهانێک کە لە دەریادا وێنەی نییە و ئەوەی نەیبینێت ناتوانێت لێی تێبگات، ئەو جیهانەی پێی دەوترێت جیهانی خاک.)

جیهانی مرۆڤ بەهەموو گەرمی و ڕەنگە تۆخەکانی، جیهانی مانگ و خۆر و ئەستێرە، جیهانی ڕۆشنایی کەنار دەریا، جیهانی مرۆڤ و ئاشووبەکانی، بگرە جیهانی مرۆڤ و جوانییەکانیشی، لەسەرەتاوە بینینی جوانییەکان بەچاوی کراوە و

ماسیانەی خۆمان، خۆر و شەپۆلە نەرم و ڕەنگە شینەکەی دەریا، بەڵکو هەست کردن بەئاوی دەریا ئەو ئاوەی هەموو گیانی ئێمەی گرتووە و جووڵە بە ئێمە دەبەخشێت، بینینی سێبەر و هەورەکان و باران ئێمەی لە ئێرە دوور خستوەتەوە و نەویستانە بۆ لای خۆیان ڕایانکێشاین و خواحافیزیان لە مامۆستاو نیشتیمان پێکردین.

ماسیەکە وەک ئەو ماسیەی هەزاران وێنە و ئەزموونی سەیر و سەمەرەی پێش چاو کەوتبێ و لەهەزاران شووشەدا ئەم دەست و ئەو دەستی کردبێت و لەهەزاران جۆگە و ڕووباری دابێت، بەهەموو متمانەیەکەوە قسەی دەکرد و سەرنجی ماسیە پیرەکانی بۆ خۆی ڕاکێشا کاتێ وتی: (هەموو دوژمنێکیش بۆ ئەوەی بۆ خۆیت بەرێیت لەسەرەتاوە بە جوانییەکانی لە خۆییت نزیک دەکاتەوە، بەڵام شەڕەکان دواتر دەردەکەون، وادەزانم تا ئێرەش هەمووتان لەگەڵمدان، جوانییەکان ئێمەی بێ ئەزموونیان برد و خستنیانە نێو شەڕ و ناخۆشیەوە، چاوی هەمیشە کراوەی ئێمە ناتوانێت لەبەردەم جوانیدا خۆی ڕابگرێت، جوانی بینینمان زیاتر دەکات و لەوێشەوە زانینمان زۆرتر و ڕۆحمان ئارامتر دەبێت، بەڵام زۆرجار جوانی بەرە و شەڕمان دەبات.

جوانی خۆی خێرەو شەڕیش قۆناغی پاش جوانییە)، ئەمە یەکێک لەو حیکمەتانەیە ئێمەی ماسی گەڕیدە پێی گەیشتووین، بەڵام ئەمڕۆ دەمەوێت لەو گەشتە بێ نیهایەتەی خۆمدا قۆناغێک دوورتر بڕۆم، واتە دۆزینەوەی قۆناغی دوای شەڕ.

ئێمە نەگەشتینە خۆر، ئەو دەمەی کە پەنجا ماسی زۆر ورد بووین و لەڕووی دەریاوە شێتگیرانە خۆمان بۆ هەڵدەدا و شۆکێک بوو بۆ ئێمەی قوتابی نەک بۆ مامۆستا، کاتێک بۆیەکەمجار خۆرمان بینی، حاڵەتێکی شێت ئاسا، ئەو حاڵەتانەی دەریا قوڵەکان ناو هەناوی ماسی دەهەژێنێت و جەستەی دەلەرزێنێت ئێمەی گرت مامۆستاش زۆر بەئارامییەوە سەیری دەکردین، ئەوی بەئەزموون و تەمەن خۆری بینی بوو ڕەنگی ڕۆشن و ئاسمانی شینی بینیبوو، کاتێک ئێمەی دەبینی لە هەڵبەزو دابەزدابووین هیچ ڕێگیرییەکی لێنەدەکردین دەیزانی بینین و کەشفی جیهانی نوێ ئاواشۆکێکی بەشوێنەوەیە، بۆیە وازیلێهێناین تاخۆمان ئارام بینەوە پاشان شەو تا بەیانیش بێبێزاربوون سەیری دابەزینی ئەستێرە و تریفەی مانگمان بۆ دەریا دەکرد و لە ژێرتوێژێکی تەنکی دەریاوە بەچاوی کراوەوە تەماشامان دەکرد.

پاشان بەیانی بەهەموو نوێبوونەوە و فینکی و جوانییەکانی خۆیەوە دەرکەوت، کاتێک پەخشانی قژی تیشکینی بەرهەواوخۆر رووی هەموو دەریا دەگرێت. کاتێک خۆر تەنیا تەوقەسەری دیارە و ئەو قژە تیشکە درێژانەی بەسەر هەموو دەریادا بڵاودەبێتەوە جوانییەکی وای هەیە کە ئێمە هەرگیز شتی وامان نەبینیوە، لەوێدا بوو ئێمە مامۆستامان بەجێ هێشت و هەر پەنجامان بەرە و کەنار ڕۆیشتین، کاتی ڕۆیشتنمان بەرە و کەنار خۆمان بۆ نێو هەوا هەڵدەدا و دەکەوتینەوە دەریا، بۆیەکەم جار شاخ و پاشان کەنار ئینجا شار و پاشتریش خانوەکانی مرۆڤ و کەشتیە زەبەلاحەکان ئەو کەشتیانەی سەدانیان لەکەنار دەریادا وەستاون، چاوی هەمیشە کراوەی ئێمە هەموو ئەو شتانەی بینی، ئەو کەشتیانەی پڕ لە تۆڕی ڕاوی گیانی ئێمەن، بەڵام بە ورەی ئاشتی خوازانە و ڕۆحی ئارامەوە بەرە و کەنار ڕۆیشتین و بۆیەکەمجار مرۆڤمان بینی ئەو سەدان مرۆڤە نیوە ڕووت و نیوە پۆشتە و جەستە سوتاوانەی لەسەر کەشتیەکان خەریکی کارکردنن، ئەوان ئێمەی وردیان نەدەبینی، بەڵام ئێمە بەچاوی ماسیانەی خۆمان سەیرمان دەکردن، ئێمە تەنیا بەسەیرکردنی ئەو جیهانە ڕازی نەبووین، بەڵکو دەمانویست لەگەڵی

تێکەڵ بین، بۆیە زیاتر بەرەو کەنار خۆمان ڕادەکێشا
ئەو شوێنەی تاشە بەرد و بەردی خڕ و لمی کەنار
دەریای لێیە، لەوێ مرۆڤی گچکە و مناڵمان بینی، ئەو
منالانەی خەریکی ماسی گرتن و گەمەکردن بوون،
ئەوان وەک گەورەکان کێشی ماسیە ڕاوکراوەکانیان
بەلاوە گرنگ نییە، بەڵکو گرنگ تەنها ڕەنگی
ماسیەکانە، ئەوان تەنیا ماسیە ورد و ڕەنگاو
ڕەنگەکان ڕاو دەکەن، واتە، ئەوان بەشوێن ئێمەدا
دەگەڕان ئێمەی مرۆڤ نەدیدە و لە قولایی دەریاوە
هاتوو، ئێمە نەماندەزانی ئەگەر تەنیا چەند ساتێکیش
لەئاو داببڕێین دەمرین و ڕۆحی ئێمە خۆلادان و
ململانێی تێدا نەبوو، ڕۆحی ئێمە چاک لە گوتەکانی
ئاو دەگەیشت بەلام ئاشنای شەڕە ئازار بەخشەکانی
مرۆڤ نەبوو، ئێمە دەریا ماڵی هەموومان بوو و
نەماندەزانی کە هەرکام لە مرۆڤەکان ماڵی تایبەت بە
خۆ و خواردنی تایبەت بە خۆو ناوی تایبەت بە خۆ و
خاکی تایبەت بە خۆ و خودای تایبەت بە خۆ و
نوێژی تایبەت بە خۆیان هەیە، دەریا خواردنی هەموو
ماسیان دەدا و زمانی دەریا زمانی هەموویان و
یاساکانی دەریا یاسای هەموویان و خوای دەریا
خوای هەموویانە، ئێمەی ئازاد ئەرکی خۆمان
بەرامبەر بە دەریا جێبەجێ دەکەین، هیچ ماسیەک

ناتوانێت لەیاساکان دەربچێت، چونکە دەریا لە هەموو شوێنێکی ئێمەدا هەیە، بۆئەوەش فەرمانەکان بەجێ بهێنین دەبێت زیندوو بین، بۆیە ئەو ماسیەی دەمرێت دەریا فڕێی دەداتە دەرەوەی خۆی، لەدەریادا بەجێهێنانی ئەرک هاوکاتە لەگەڵ ئارامی و پێگەیشتنی ڕۆحی و لەزەتی ماسیان، ماسیان دەریای پاکیان خۆش دەوێت و دەریاش ئەوانی خۆش دەوێت، بۆیە لەهەناویدا هەڵیان دەگرێت و دەیانپارێزێت، دەریا دایکی هەموو ماسیانە و زۆر دادوەرانە و زۆر بە وردی شتەکانی هەناوی بەسەریاندا دابەش دەکات، دەریا دەزانێت لە چ ئان و ساتێکدا چی دەکاتە خۆراکی چی، بۆیە لەدەریادا نەئەزمەی خۆراک و نەشەڕی بەکۆمەڵ لەسەر خۆراک ڕوونادات.

(دەسەلات لەدەریادا تەنیا بەدەست دەریایە و ماسیان هەرچەندە گەورە یان بە بەمەعریفە یان ڕۆحانی بن، ناتوانن گوێرایەڵی ماسیەکانی دیکە بۆ خۆیان مسۆگەر بکەن بێجگە لە (ئاو) کەس (مافی) ئەو دەسەلاتەداریەی نییە. شەرعیەتی گوێرایەڵی تەنیا بۆ دەریای پاکۆکەر و بەسۆزە).. (ئاو) ڕۆحی شتەکانی ناو هەناوی حۆیەتی.

ئەو دەمەی شتە وەستاو و مردووەکانی جیهانی مرۆڤ و دارە کەشتیەکانی کە دێنە دەریاوە گیان

دەچێ بەبەریاندا و دەبزوێن، لەڕاستیدا دەریا خۆی دەکاتە ڕۆحیان، دەریای بەکەرەم و بەزەیی نەک هەر بەو پەڕی بەخشندەیی و جوانی و خۆراک و ئارامی بەهەناوی دەبەخشێت، بەڵکو دەیەوێت هەناوی جیهانێکی پاک و ڕازاوە بێت... دەریا (ماسیان) بێجگە لە خۆیان لەهەموو شتێکی دیکە پاک دەکاتەوە، دەریا بەڵکو بەزەیی بەجیهانی مرۆڤ و خاکی تینوشدا دێتەوە، هەم ئاو بۆ بیابان و شاخە دوور دوورەکان دەنێرێت، هەم پیسیەکانیش پاک دەکاتەوە. هەموو ماسیەک لەدەریادا خاوەنی هەموو شتێک و لەهەمانکاتیشدا خاوەنی هیچ نییە، وەک چۆن هیچ ڕۆڵەیەک خاوەنی دایکی خۆی نییە و لە هەمان کاتیشدا دایک دایکی هەرکامیانە، ڕێسای خاوەنداریەتی لەدەریادا بوونی نییە، لەدەریاشدا خاوەنداریەتی بۆ هیچ ماسیەک بوونی نییە، لەوانەیە تەنیا مانایەک نەشێ ماسیان لێی تێبگەن مانای (خاوەنداریەتی) بێت.

ماسیەکە بێ هیچ ئاڵۆزییەک بەبادانی جەستەیی و بەیارمەتی ئاو ئەم شتانەی وت و ماسیە حەکیمەکانیش بەهۆی بینینی پێشتری جیهانی مرۆڤ لە زۆربەی زۆری قسەکان دەگەیشتن، ماسیەکە بە بزواندنی جەستەی درێژەی بە قسەکانی دا وتی:

(ئێوە هەموو دەزانن پێچەوانەی هەموو ئەو شتانە لە جیهانی مرۆڤدا بوونی هەیە.)

من دەزانم ئەگەر مرۆڤ لەدەریادا دەژیا و وەک ئێستاش زۆر دەبوو، ئەوا لە دەریادا جێگەی هیچ گیاندارێکی دیکە نەدەبووەوە، ئەگەر مرۆڤ لەئاودا بوایە و ماسیش ساف بوایە، وەک ماسیش خێرا بوایە لە بزواندا و ئامرازەکانی دروست کراوی خۆی پێبوایە، ئەو ئامرازانەی پاش بەینێک بەکارهێنان دەبنە بار و جێگەی دەگرن، خراپتر لە هەمووی ئەو پاشەڕۆیانەی لەو ئامرازانە دەردەچن ئەگەر لەدەریادا بن پاش بەینێک دەریای شین وەک ڕەشایی داری سووتاو و خەڵووزی لێدەهات، ئیدی لەدەرەوەی گۆی زەوی و لە دوورەوە دەریا شینی نەدەنواند، ئیدی چاوی کراوەی ماسیان ئەو چاوانەی بەردەوام دەریا دەیانشواتەوە کوێر دادەهاتن و لەدەریادا هیچیان نەدەدی، ئەگەر مرۆڤ لەدەریادا دەژیا و کوشتن و شەڕەکانیشی وەک ئێستا بەردەوام بوایە و ئەوا دەریا فڕێی دەدایە دەرەوەی خۆی و ڕووی دەریا بەبەرزایی چەندین نەهەنگ پڕ لە لاشەی مرۆڤ دەبوو و، ئیدی نەدەکرا هیچ نیوەڕۆیەک خۆر تیشکەکانی بەدەم باوە بدات و لەناوەڕاستی ئاسمانەوە خۆی هەڵبداتە دەریاوە، هیچ شەوێکیش

بەهەزاران هەزار ئەستێرە لەدوورەوە نایەن و بەزۆر مانگی شەرمن ڕابکێشنە نێو دەریاوە، ماسیانیش لە ژێر توێژێکی تەنکی دەریاوە سەیریان بکەن، هەموو ڕەنگەکان بەڕەنگی سوور دەشۆرانەوە، هەورەکان بارانی سووریان دەباراند، ئەگەر مرۆڤ لەدەریادا دەژیا، ئەوا نەمرۆڤ دەبوو، نەماسیش دەبوو، ئەو ماسیانەی زۆربەی مەقامەکانی بینین و ئەزموونی بینیوە، ئەزموونەکانی لەبەردەم هەزاران ماسی لە خۆی ژیاوتردا دەگێڕایەوە، بەبزواندنی جەستەی ماناکانی دەداو شیتەڵکردنی ئەو ڕووداوانەی بۆ هەرکام لەوان بەجێ دەهێشت، ئەو لەوە گەیشتووە کە دەبێت هەموو ماسیەک بۆ خۆی شتە بینراوەکان بۆ ڕێسا و مانای نەبینراو وەربگێڕێت...

دەیوت: (مرۆڤە بچووکەکان، ئێمەی بچووک بەڵام ڕەنگاو ڕەنگیان زۆر بەئاسانی گرت و لەناو شوشەیان دانان، شووشەی وەک ئاو ڕوون کە لێیەوە هەموو شتێک بەڕوونی دەبینرێت، بەڵام وەک ئاو ناسک و نەرم نا، کە ڕێگەت بدات بەئاسانی بەنێویدا بجوڵێیت، صئێمە لەو زیندانە لە شووشە دروستکراوانەوە بەچاوی کراوەی خۆمان سەیری جیهانی مرۆڤمان دەکرد، مرۆڤ ئێمەی لە شووشە پەساوت بۆئەوەی سەیری ئێمە بکات، نە ئەوەی ئێمە

سەیری جیهانی ئەو بکەین، جولانی ماسی واتە جولانی ئەو شووشانە بەدەستی مرۆڤ، ئەگەر مرۆڤ حسێبی بۆ بینینەکانی ئێمە و چاوی هەمیشە کراوەی ئێمە نەکردووە، بەڵام ئەوە ئەوە کە جێگە و بارگەی بۆ ئێمە دیاری کردووە، مرۆڤ ئازادە ئێمە لە کوێ دادەنێت.)

ئەگەر مرۆڤ ناتوانێت بێ خەوتن بەدیار ئێمەوە لە حەوزی شوشەدا دابنیشێت و چێژ لە جیهان و ڕەنگی ڕازاوەی ئێمە بەرێت وەک ئەوەی کە ئێمە دەیکەین شەو و ڕۆژ سەیری ئەومان دەکرد، بەڵام خۆ ژیان و مردنی ئێمە بەدەستی ئەوە، مرۆڤ دەتوانێت لەئاودا دەرمان بهێنێت و بەهەوا ژەهراوی ببین و بخنکێین، بەسە تەنها بۆ ڕۆژێک ئاوی ئەو شوشانە نەگۆڕێت و بێهەوا بمرین، ئێمە لەو شوشانەدا فێری ژیانی تەنیایی بووین، تەنیایی چەند سەختە بۆ ماسیەک کە بەئازادی بەدەریای فراواندا گەڕابێت، بەڵام تەنیایی مایەی قوڵ بوونەوەیە، قوڵبوونەوە لەئاو و خاک و مرۆڤ، تەنیایی فێرت دەکات تێبگەیت ببینیت تەنیایی ئامرازی فێربوون نییە، تەنیایی فێرت دەکات تەنیا بیر لەوە بکەیتەوە چییە ئەم هەموو توانایە بە مرۆڤ بەم (مەخلوقە) دەبەخشێت... بیر لەوە بکەیتەوە جیاوازیەکانی خاک و

ئاو چین ، چییە مرۆڤ لە ماسی جیا دەکاتەوە، تەنیای وات لێدەکات کە تەنها بە بینراوەکان ڕازی نەبێت، ئەگەر هەرکام لە ئێوە و منیش بەوەوە وەستاین کە چاوی هەمیشە کراوەمان پێی دەوتین، ئەوا هەموو ئەو شتانەمان نەدەزانی کە ئێستا دەیزانین.

ئەو منالانە ئێمەیان بردە بازاڕ بۆ فرۆشتن و لەیەکتر دابڕاین، ئیدی بازاڕی قەرەباڵغی مرۆڤمان بینی (بازاڕ!!) شوێنی پیشاندانی شەڕەکانی مرۆڤ، لەبازاڕدا مرۆڤ حەز دەکات هەموو بوون بە مرۆڤەکانی دیکەشەوە هی ئەو بن و بیهێنێت لەبازاڕدا بیانفرۆشێت، بازاڕ جێگەی دەرکەوتنی خۆپەرستی و ململانێ و ژیری مرۆڤە، لەبازاڕدا مرۆڤ نەک هەر خۆی پیشاندەدات کە وانییە، بەڵکو شتەکانی تریش وا پیشان دەدات کە وانین.

لەبازاڕدا وەک سەدان و هەزاران شتی دیکە فرۆشراین و ئیدی یەکترمان نەدیەوە، مرۆڤ بەدەسەڵاتی خۆی ئێمەی لەیەکتر جیاکردەوە، هەموو ماسیەکی ڕێبوار لە خۆی دەپرسێت (سەرچاوەی دەسەڵاتی مرۆڤ چییە؟ ئەگەر هێز بێت، ئەوا خۆ ئێمە زۆرجار لە جیهانی مرۆڤدا بینیومانە مرۆڤە زەبەلاح و گەورەکان گوێرایەڵی مرۆڤە گرگن و بەجەستە

بچووکەکانن. ئەگەر زانین سەرچاوەی هێزی مرۆڤ بێت، ئەو زانینانەی لەزەین و لە کتێبەکاندا خەزنیان دەکات ئەو زانینانەی وەک زانینەکانی دەریا لە هەموو دەریادا نەپژاون، مرۆڤ ئەو زانینانە بۆ کۆنترۆڵکردن و ئازاردان بەکاردەهێنێت ئەی بۆچی ئەو زانینانە لای هەموو مرۆڤەکان نین)؟

ئێمەی ماسی بە هەموو ئەو شتانەی بەر چاوی هەمیشە کراوەمان کەوتوون ئەوە فێربوین بەراوردی (ئاو) و (خاک) پێکەوە بکەین، وەک ئەوەی هەموو چاکیەکان هی ئاوی پاک و نەرم و ئارام بن و هەموو خراپیەکانیش هی خاک ئەی بۆچی نا؟ ئەی ئەوە نییە مرۆڤ لەخاکدا بینا و کۆشکە گەورەکان و دەرگا و پەنجەرە داخراوەکانی دروست کردووە؟؟ ئەی ژێرزەمینە دوور و درێژە تاریکەکانی؟؟ زنجیرو شیلاقە ئاسنینەکانی؟؟ تەنانەت کەشتیەکانی کە بۆ ناو جەرگەی دەریا دێن، هەموو ئامێرە ئازاردەر و سوتێنەرەکانی ئەو ئامێرانەی گیانداران، بگرە مرۆڤەکانیش دەکەنە قوربانی خۆیان.

مرۆڤ ئامرازەکانی ئاگر خستنەوەی لەخاکەوە دەست دەکەوێت، لەکاتێکدا ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوە. مرۆڤ شارەکان گڕتێبەردەدا و دەریا بارانیان بەسەردا دەبارێنێت، خاک دەبێتە گۆڕستانی

مرۆڤەکان و ئاو ژیانیان پێ دەبەخشێت، هەموو ڕەشی و تاریکیەکانی لە خاک و هەموو جوانی و گەشاوەیەکیش لە ئاوەوەیە، خاک دەیەوێت وەک مرۆڤ ئاویش بمرێنێت، بەڵام ئاو مەرگی نییە، بۆیە کاتێک خاک ڕێی لێدەگرێت و بۆ کوشتنی هەوڵ دەدات ئاو دەبێتە هەڵم و دەڕوات. ئاو هەمیشە بەسەر گڕی شەڕەکانی خاکدا دەبارێ و دەیانکوژێنێتەوە، بەڵام هەرگیز شەڕ ناکات، بۆیە کە زانی شەڕ بەئەو کۆتایی نایە ئەو شوێنە بەجێ دەهێڵێت، تەنانەت ئەگەر لەسەر زەویش جێگەی پێ تەنگ بکەن دەبێتە هەڵم و دەچێتەوە ئاسمان.

ئاو هەمیشە ڕووتە و حەزی لە ڕووپۆش نییە، ئاو ئەوکاتە ئاوە کە شتی دیکەی تێکەڵ نییە، هاوارەکانی لە دژی شەڕەکانی خاک ناڕاستەوخۆن، دەبێتە هەورو دەگرمێنێ، دەبێتە تەرزەی ڕەق و بەلێزمە بەسەر خاکدا دەبارێت و مان دەگرێ و دەبێتە سەهۆڵ و بەتکا کاری خۆر نەبێت بەری نادات. ئاو گشت گیانی گوێیە، بەڵام کپ و ئارامە، ئەی ئەوە نییە هاواری دەشتە وشکەکان دەبیستێت و بارانیان بۆ دەبارێنێت، ئەی ئەوە نییە بانگی شاخی گوێ لێیە و بەفر و تەمی بۆ دەنێرێت.

ماسیه گەڕاوەکە بۆ ماوەیەک جەستەی بزواوی لە جوڵە وەستاند و پاشان دەستی بە قسە کردەوە، دەبێت ئەوەش بزانین کە خاک پێش پەیدابوونی مرۆڤ وەک دەریا وابوو، مرۆڤ خاکی خستە ژێر پێی خۆی، ئاگر نەک خاک دایناگرسێنێت، بەڵکو ئەوە خاکە بەدەستی مرۆڤ دەسووتێت، ڕاستە خاک لەئاو کەمترە، بەڵام ئەویش وەک دەریا ژیانی ڕێک دەخست تا ئەو کاتەی مرۆڤ.پەیدابوو، خودایە!!! ئەم مەخلوقە سەیرە لە کوێوە پەیدابوو، مرۆڤ ئەگەر خاکی پێش دەریا تێکداوە، ئەوە لەبەر ئەوەیە کە گیاندارێکە لەسەر خاک دەژی، ڕاستە شاخەکانی خاک لە مرۆڤ گەورەترن، بەڵام ئەوان توانای جوڵانیان وەک مرۆڤ نییە.. (زۆربەی گیاندارەکانی خاک وەک مرۆڤ لەسەر خاک دەژین، بەڵام ئەوان دەتوانن تەنیا بەو شێوەیە بژین کە دەژین، مرۆڤ دەتوانێت بەو شێوەیە بژی کەوا نییە)، ماسیە قسەکەرەکە بۆ ساتێکی دیکە وەستا و وەک ئەوەی سڵاو لەگیانی سووتاوی خاک بکات ڕووی کردە سەر ڕووی دەریا و ڕوو بە جیهانی خاک ساتێک کپ بوو و پاشان ڕووی کردە ماسیە حەکیمەکان و درێژەی بە گوتەکانی دا، ئەگەر (با) ڕوو لە خاک دەکات و لێی توورە دەبێت هەروەها لە دەریاش، بەڵام کەبەسەر خاکدا زاڵ دەبێت و دەچێتە

هەموو کونج و کەلەبەرێکی خاکەوە لەکاتێکدا دەریا ڕێگە بە (با) نادات سینگی لەت بکات و بەرەو هەناوی بڕواتە خوارەوە لەبەرئەوەیە خاک لە دەریا بەستەزمانترە.

دووبارە مرۆڤ لەبازاڕدا پارە بە ڕەنگەکان دەدات، واتە ڕەنگاو ڕەنگترین ماسی زۆرترینی نرخی هەیە، لەبازاڕدا مرۆڤ حسێب بۆ ڕۆحی تۆ ناکات... بۆ حیکمەتی تۆ ناکات. لای مرۆڤ ڕەنگەکان نرخیان هەیە، بەڵام ڕۆح و حیکمەتی قووڵ بەهایان نییە.. ئەو ماسیەی ڕەنگی زیاتری هەبوو، ئەوا بۆ جیهانی گەورەتر دەبرێت، تا ئەوەی ماسیە زۆر ڕازاوە و ڕەنگاو ڕەنگەکان دەبرێن بۆ کۆشک و دەربارە زۆر گەورەکان... ئەو خانوانەی ماسی بەچاوی ماسیانەی خۆی سەیری دەکات و سەری لە داهێنراوەکانی بەشەر دەسوڕمێ، لە ئەو وردەکاری و ئەندازە و ڕەنگە جۆراوجۆرانەی لە دروستکردنیاندا بەخەرج دراون، ئەو فەرش و ئاوێنانەی ناو ئەو دەربارانەیان داپۆشیوە کە بەڕێکەوت ماسی لەبەردەم ئەو ئاوێنانەدا دادەنێن و ئەوجا خۆی دەبینێت و سەری لە جوانی ڕەنگەکانی خۆی دەسوڕمێ، ماسی لەو خانووە گەورانەدا لە تەنکترین شووشەدا دادەنرێت هەتا جوانتر دەربکەوێت، بەڵام ئەمیش لای خۆیەوە

بۆ بینینەکانی خۆی سوود لەو تەنکیە وەردەگرێت، لەو جێگایانەدا کە ڕەنگە گەورەترین جێگا و چۆڵترین شوێنی مرۆڤ بن و کەمترینی مرۆڤەکان و ماسیە ڕەنگاو ڕەنگەکان ڕێیان لێیبکەوێت، سەیرترین خەسڵەتەکانی مرۆڤ لەو خانوانەدا دەردەکەون، لەوێ ماسی دەبینێت کاتێک مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤەکانی تردایە چۆن مامەڵە دەکات و کاتێکیش کە تەنیایە چۆن؟ ئەوان ئەو کاتەی کەلەبەردەم خەڵکیدان تورەیی و ڕقەکانی خۆیان دەشارنەوە و، کاتێکیش کە تەنیان بەیەکتر پێدەکەنن یاخود بۆ ناتەواویەکانی خۆیان دەگرین. مرۆڤ کەتەنیا بوو دەرگای نهێنییەکانی خۆی دەکاتەوە و دەگری. دەگری و بێ ئەوەی هیچ حسێبێک بۆ چاوی ماسیانە و هەمیشە کراوەی ماسی بکات، مرۆڤ زۆر حەزی لە سەیرکردنی پولەکە ڕەنگاوڕەنگەکانی ماسیە، تەنانەت دڵرەقترینی مرۆڤەکانیش، ئەوانەی مرۆڤکوژ و بەرپرسی ژێر زەمینەکانن، ئەو زیندانانەی جێگەی ئازاردانی مرۆڤەکان و ڕۆح کێشانیانە ئەو زیندانانەی تاریکترین و نزمترین خانووە دروستکراوەکانی مرۆڤن.. ئەو زیندانانەی دەرگاو پەنجەرەکانیان ئاسنن، ئاخی مرۆڤ لەو زیندانانەدا عەرش و قورش دەلەرزێنێ، لەوێ نەویستراوترین مەرگ ڕوودەدات،

بەرپرسی ئەو ئازار و مەرگ و تاریکی و تەنیاییە لەتەنیاترین و ڕوونترین و پاکترین ژووری ئەو زیندانەدا (واتە لە ژووری بەرپرسی ئەوێ) لەسوچێکی ئەو ژوورەدا ماسی لەنێو شووشەدا دانراوە، لەو ژوورەدا دلڕەقترین مرۆڤ لەزەت لەسەیرکردنی ماسی دەبات، ئەو حەزە ماسی دەباتە بنی زەوی نێو ئەو زیندانە تائاگای لە کوت و برین و ئازارەکانی مرۆڤ بێت، ئەو حەزە ماسی دەباتە زیندان، مرۆڤ وەک جەستە گەورە دەبێت و وەک عەقڵ بیردەکاتەوە و ئاسمان پێش زەوی دەلەرزێنێ. (زمان) لەوانەیە لای ماسی بێ ماناترین شتێک بێت کە مرۆڤ دایهێناوە، ئیدی بەو مانایە مرۆڤ شتەکانی تایبەت بە خۆی کردووە، بۆ نموونە بەبەراورد لەگەڵ دەریادا ئەگەر لێرە زانین لەهەموو دەریادا پژابێت بۆ ئەوەی زیاتر فێر بێت، دەبێت زۆرتر دەریا بگەڕێت، بەڵام مرۆڤ زانراوەکانی لەنێو عەقڵ و کتێبە تایبەتەکانیدا هەڵدەگرێت، هەرکام لە مرۆڤەکان دەیەوێت زۆرترینی زانراوەکان بۆخۆی قۆرخ بکات، نەک هەر زانین بەڵکو زەوی زۆرتر و ئاسمانی زۆرتر و مرۆڤی زۆرتر پارەی زۆرتر.

ئەو هەوڵەی مرۆڤ وادەکات شارەکان، کۆشک و خانووە گەورەکان، ئاژەڵەکان، ماسیەکان، هەرکامیان

بەشی خۆی لەویتریان زیاتر بکات، ئەمە نەک هەر تاک بەڵکو کۆمەڵە مرۆڤەکانیش وان. واتە ئەم کۆمەڵە دەیەوێت هەموو شتەکانی لەوی تر زۆرتر بێت.

کارکردن و توانای خوڵقاندنی مرۆڤ نەک هەر ئەم خەسڵەتەی مرۆڤی کەم نەکردۆتەوە، بەڵکو بەهۆیەوە تاوی سەندووە، ئیدی ئەوە مرۆڤە دەریا و باو خاکی داوە بەگژی یەکتردا، سەدان جۆر مرۆڤ و ئاژەڵی ڕووبەڕووی مەرگی خۆیان کردوەتەوە.

مرۆڤ لەم کارەیدا بۆ زۆرکردنی بەشی خۆی تەنیا سوودی لە (کڕین) و زۆرداری نەبردووە، بەڵکو ئەم کارە زۆر لەوە ئاڵۆزترە تەنانەت ماسیەکی حەکیمیش لێی تێبگات، هەرکام لەخاوەن دەسەڵاتەکان زۆرترین خاکیان بۆ خۆیان پچڕاندووە، ئەوانە دڵ و ڕۆحی ئەوانی تر بۆ خۆیان مسۆگەر دەکەن و یاسا دادەنێن و شەرعیەت بەو یاسایانە و شتە تایبەتییەکانی خۆیان دەدەن.

من لە هەموو هاوڕێکانم ڕەنگی تۆخ و زۆرترم هەبوو. ئەوەش هەلی زۆرترین ژیان و بینینی زۆرترین جێی جیهانی مرۆڤی بۆ خوڵقاندوم سەفەرێکی بێنیهایەت و بیابانی نەبڕاوەی ڕۆحی مرۆڤم تەیکردووە، ئەو مرۆڤەی لەسەرەتاوە پارچە

گۆشتێکی بچووکە و لەسەر خاک دەڕوێت و پاشان خۆی دەکاتە خاوەنی زەوی...

ئێوە هەمووتان ئەو گەشتە بێکۆتاییەتان بۆ جیهانی مرۆڤ... تەمەنێک ڕۆیشتن... تەمەنێک بینین... تەمەنێک ئەزموون گەشتێک کەتەمەنێک درێژەی هەیە بەجێهێناوە. لەگەڵ ئەوەشدا دڵنیام و داوای لێبووردن لەتەمەن و حیکمەت و ڕۆحی پێگەیشتوو و ئەزمونەکانی ئێوە دەکەم، لەگەڵ ئەوەشدا دڵنیام کە زۆربەی زۆری سەفەرەکانی ئێوە نەگەیشتونەتە قوڵایی ژیانی مرۆڤ، ئەوە ڕاستە جیهانی مرۆڤ جیهانی تایبەتیکردن و مافە، مافی بەکارهێنان، مافی وتن، مافی خواردن، مافی سەفەر و مافی دابڕانی زەوی موڵکداریەتی، بەڵام بوونی هەر مافێک بێبەشی ئەوانی دیە لەو شتە، ئەگەر مرۆڤێک خانوویەک، کتێبێک، خواردنێکی هەیە، ئەوە مانای ئەوەیە تایبەت بە ئەوەو ئەوانی دی مافی ئەوەیان نییە سوودی لێ ببەن، بەڵام ئەوە لە جیهانی مرۆڤ دەرچووە و گەڕانەوەی نییە، ناشێت هەرگیز ناشێت، هەموو مرۆڤەکان وەک ماسیان ئارام و هێمن بن و دەریاش بەکەرەمەوە بەشیان بدات، هەرکامیان چەندیان بوێت فێربن، بخۆن، نەک هەر کەسیانماڵی تایبەت بە خۆیان نەبێت، بەڵکو دەریا ماڵی هەموویان و

لەهەمانکاتیشدا هی هەرکامیشیان بێت... مرۆڤ ناتوانێت وابێت، واتە جەوهەری مرۆڤبوونی ڕێگەی ئەوە نادات، دەزانم پێتان سەیرە، بەڵام ئەزموون و حیکمەتی ئێوە واتان لێدەکات هێشتا گوێم لێبگرن، پاکی و نەرمی ئاو فێری کردوون ئارامتان هەبێت.

ماسیەکە وەک ئەوەی هەیبەتی ماسیەکان لەدڵیدا گەورە بێت، بەشەرمەوە ڕاکانی خۆی دەردەبڕی و دەیوت: (بەڵام من پێم وایە ئەوە ڕووکەشی مرۆڤە و هەرگیز بەهای ژیانی مرۆڤ لەوەدا نییە، مرۆڤ وەک پارچە گۆشتێکی نەرمی پڕ لە خوێن پێ دەنێتە جیهان، خاک و ئاو و هەوا نازی دەکێشن و پاشان لێیان هەڵدەگەڕێتەوە هیچ کام لەگیانداران ناتوانن وابن، مرۆڤ ئەگەر لە بووندا تەنیا ئەرکی سەرەتایی خۆی بە جێ بهێنایە، بێگومان مرۆڤ نەدەبوو، مرۆڤ دەتوانێت جیا لەوەبێت کە هەیە، بەڵام مەرجە ئەم خۆنەبوونە تەنیا بە دیوی خراپەدا بێت، ئەگەر دەریا، خاک، هەوا تەنیا دیوێکی تەجەللای ئاسمان بن. ئەوا مرۆڤ ئەوە پیشان دەدات کە شیمانەی دیوی دیکەی نادیار هەیە و ئەوەش نوکتەکەیە!!

ئەگەر مرۆڤ شارە گەورەکان دروست دەکات، ڕووناکیان دەکاتەوە ئەگەر مرۆڤ چەکە بکوژەکان دروست دەکات.... ڕێگە دوورەکان نزیک دەکاتەوە.

ئەگەر مرۆڤ نەوەی زۆر دەخاتەوە و هەموو سارا و شیو و شاخەکان داگیر دەکات... ئەگەر مرۆڤ ئاگر دەکاتەوە و ماسی پێدەبرژێنێ... پارە دروست دەکا و دونیای پێدەکڕێ و دەفرۆشێ... بە ئامێرەکان دەتوانێت تواناکانی بینین و بیستنی چەند قات بکاتەوە... ئەگەر جیهانێکی هەیە خولقاوی خۆیەتی... ئەگەر دەتوانێت بیرەکانی لەنێو پەڕە و کتێبەکاندا بۆ نەوەکانی داهاتوو هەڵبگرێت.... پاشان مرۆڤ ئەگەر دەگری و ئاوی دەریا دەبێتە فرمێسکی چاوەکانی، ئەگەر مرۆڤ شەرم دەکات و پێدەکەنێت، ئەگەر گیاندارێک نەبێت ئازاری دەستی مرۆڤی نەچەشتبێت، ئەگەر مرۆڤ هەرگیز گوێ لە گیاندارانی تر ناگرێت و حسێب بۆ بیستن یاخود بینینەکانی ناکات، ئەگەر ڕۆحیان بریندار دەکات، بەڵام ئەمە ڕووی وێرانکەری مرۆڤە و کۆمەڵگەی مرۆڤ بەوە نەوەستاوە، دۆزینەوەی ڕۆحی ئەو کۆمەڵگەیانە گەشتێکی درێژتر و بینینێکی زۆرتر و ئارامێکی گەورەتری دەوێت... ماسیش نەبینینەکانی و نەگەڕانەکانی بەدەست خۆی نییە، بۆیە تەنیا قەدەر ئەوە دیاری دەکان کام ماسی زۆرتر دەبینێت... ڕەنگە تەنیا ڕازاوەیی پولەکە و گەورە نەبوون هەلی زیاتر بینین زیاتر بکەن، چونکە تا ماسی ڕازاوەتر و بچووکتر بێت، زیاتر لەنێو ماڵ و

نزیکتر لە مرۆڤ و دواجار دەشتوانێت نهێنییەکانی زیاتر بزانێت،

ئەو شتانەی ڕاگیرکەری کۆمەڵی مرۆڤن نەبینراون، ماسیەکانیش بەچاوی کراوەیان زانین وەردەگرن، بۆیە گرانە زۆر گرانە ماسیە گەڕیدەکان جەوهەری مرۆڤ کەشف بکەن، تا دوای گەڕانەوە باسی بکەن، ڕەنگە دواتر کاتێک ماسی دوای سەفەری دورو درێژی بۆ جیهانی مرۆڤ زەمەنێکی زۆرتر بەئارامی و تەنیایی گوێ لەترپەی دەریا بگرێ و گوێ لە حیکمەتە نەبینراوەکانی ئاو بگرێت و کە ڕۆحی گەورە دەبێت ئینجا بتوانێت مرۆڤ بناسێت و لە (شەڕ) ماهیەتی مرۆڤ جیابکاتەوە و ماسیە مرۆڤەکان بناسێت، ئەو مرۆڤانەی ڕۆحیان پەروەردە دەکەن، ئەو مرۆڤانەی ڕۆحیان شەفافە و زبریەکانی کۆمەڵگە ناسک دەکەنەوە و ڕۆحی خوێن لەبەرچووی مرۆڤەکانی دی تیمار دەکەن، ئەوانەی شەوان بێباک دەرگای نهێنییەکان دەکەنەوە بۆ ڕۆحی بریندارى مرۆڤ دەگرین، ئەو مرۆڤانەی لە حیکمەتەکانی بوون و ئاو و هەواو خاک دەگەن. سەریان لە جوانی مانگ و ئەستێران دەسوڕمێ، ئەوانەی زمانێکی دیکە دەزانن و چاوەکانیان دادەخەن تا لە هەستەکان بچنە خوارێ، ئەوان ڕۆحی جوڵاوی مرۆڤن، ئەوان لە

مرۆڤ دەگەن هەروەک چۆن ماسی لە دەریا دەگات،
ئەو مرۆڤانەی خۆشەویستی لەگەڵ هەموو شتێک
دەگۆڕنەوە و شەوان لەگەڵ بوون تێکەڵ دەبن و
ئامادەی عروجی ڕۆحین. مرۆڤەکانی دیکە ئاگایان
لێیان نییە، تەنیا ئەو ماسیانە نەبێت بەچاوی هەمیشە
کراوە و قەد نەخەوتوو سەیریان دەکەن، تەنانەت بۆ
ئەوەی مرۆڤەکانی دیکەش لەمان بگەن دەبێت
ڕۆحیان پێگەشتبێت و لەزمانی حیکمەت و هەموو
شتەکان تێبگەن، ئەگەر ئەوان نەبن کۆمەڵگەی مرۆڤ
وشک دەبێتەوە هەروەک چۆن دەریا ناهێڵێت خاک
وشک بێتەوە، ئەوان شەوان بەزمانی ماسی و
ئەستێرە و دەریا دەدوێن، کە ڕۆژیش بووەوە، دەچنە
نێو ژیانی مرۆڤەکانی دی تا زبریەکانیان نەرم
بکەنەوە و ژیان ئارامی و قوڵی بگرێتە خۆ، ئەوان پڕ
لە ئاو و نوورن و دڕ بەتاریکی دەدەن، تەنیا
ماسیەکان ئەوان دەناسن، ئەو سەدان و هەزاران
ماسیەی لە جیهانی مرۆڤدا لەنێو شوشەدا ژیان
بەسەر دەبەن و بەچاوی ماسیانەی خۆیان سەرنج
دەدەن، ئەوانەی پاسەوانی مرۆڤن (ئەگەر پاسەوان
بەدیار خەوتووەوە دابنرێت) ئەمان پاسەوانیان ناوێت،
چونکە ناخەون، بەزمانی پەیوەندی کردنی ئاسمان و
زەوی دەدوێن و داوای لێبووردن بۆ کارە

منالکارییەکانی مرۆڤ دەکەن، ئەوانەی چاوی سۆزیان ڕوون دەڕوانێت، ڕۆحیان هێندە گەورەیە دەرکی ئاه و ئازارەکانی هەموو مرۆڤەکان دەکەن و هەوڵی پێگەیشتنی ڕۆحی منالّی ئەوانی دی دەدەن، ئەوان ئەزموونی عیشق دەکەن گەرم دادێن و لەزەت لە تێگەیشتن و تەنکبوونی پەردەی نێوان ئەوان و مەعشوقیان دەبەن، ئەگەر هەر شتێک ئاماژەی ببێت ئەوان ئاماژەکانی دەخوێننەوە. ئەوەی ئەوان دەیکەن بوون گەورە دەکات، هێندە گەورە زۆر بەئاسانی جێگەی هەموومانی تێدا ببێتەوە، ئەوان ترس و غروری مرۆڤیان بڕیوە و گەیشتوونەتە حیکمەت (ئەگەر ماسی بۆ ئەوەی خۆی بناسێت و دەریا بناسێت دەبێت دەرەوەی دەریا ببینێت و لە ئاو دەرچێت، ئەوا مرۆڤیش بۆ ئەوەی خۆی بناسێت دەبێت پێ بە وجودی خۆیدا بنێت و هەزاران شار و دەریای ناو وجودی، جیهانێک کەبە فراوانی هەموو بوون لەودا هەیە ببڕێ و بگاتە جیهانی حیکمەت کەئەو جیهانە زۆر لە جیهانی بینراو فراوانترە. چونکە بینراو تەنیا دیویکی، بەڵکو توێژێکی زۆر تەنکی بەحاڵ بینراوی بوونە کە بوون هەزار دیوی نەدیتراوی هەیە، کە مرۆڤ ئەو دیوە نەدیتراوانە دەهێنێتە ئاستی بینین، ئەو هەزاران هەزار دیوە

نەبینراوانەی جیهانی حیکمەت، مرۆڤ دەبێت بەو جیهانە ئاشنا بێت ئینجا خۆی دەناسێت.)

لەوانەیە هەموو مرۆڤەکان بیانەوێت بە حیکمەت بگەن، بەڵام بەڕێگەکانی ئاشنا نەبن، هەر بۆیە مرۆڤەکان بەشەڕ تەعبیر لەو ویستەیان دەکەن، بۆ ئەوەی مرۆڤ بگاتە حیکمەت دەبێت دەرگاکانی ڕۆحی بکرێنەوە، زۆر دەگمەنن ئەو ماسیانەی لەو بابەتە تێبگەن ئەگەر چی حزووری جەستەشیان لەوێ بێت، با ئاماژەکانی جەستەی ئەو مرۆڤە بێ وێنانەش ببینن، ئەگەر بەڕۆح نەگەشتبێتنە ئەو مەقامە لێیان تێناگەن، لەکاتێکدا دەشێت ماسیان تەنانەت ئەگەر هیچ کام لەو مرۆڤانەشیان بەچاوی ماسیانەی خۆشیان نەدیبێت و ئەمان لەبنی دەریا و ئەوانیش لەسەر شاخ بن، بەڵام بە پێگەیشتنی ڕۆحیان لە ئەوانیش و لە دەریا و لە بوونیش تێدەگەن.

هەندێک لە ماسیە پیرەکان چاک لە قسەکانی ماسیە گەڕاوەکە دەگەیشتن، بەڵام ئەمانە ژمارەیەکی ئێجگار کەمی پیر و حەکیمەکان بوون، کە گەلێ جار بیئەوەی ئاویش ببینن بیوتن ئاگایان لە وتەکانی دەریا بووە، دەیانزانی تەنانەت شتە بینراوەکانیش ڕیشەیان لە جێگەیەکی نەبینراودایە، بەڵام زۆربەی مامۆستا حەکیمەکان هێشتا هەر لەو ماسیانە بوون کە زانینیان

هەر بەو شتانە لێک دەدایەوە کە بەچاوی خۆیان بینیبویان و ئەزموونیان کردبوون، ئەمانە باوەڕیان وابوو شەڕەکانی مرۆڤ نەک هەر دەریا بەڵکو ئاسمانیش دەگرێتەوە .

ئەو ماسیە زۆر پیر و حەکیمانەش کە باوەڕیان بە دیوی نەدیتراو و حیکمەت هەبوو، ئەوان دەیانزانی حیکمەت ئارامی بە ژیان دەبەخشێت.. دەیانزانی حیکمەت ئامرازی خواردن و داگیر کردن نییە، ئەگەر حیکمەت دەریایەک بێت ئەوا بینراوەکان تەنیا تەختەیەکی نێو ئەو دەریایەن، حیکمەت مرۆڤ و ماسیش ناسک دەکاتەوە، حیکمەت وادەکات ماسیان دەریا و با و خاک و خوایان خۆش بوێت.

(لە کەرەمی ئەو مرۆڤانەوەیە هەنووکە من لێرە لە قوڵایی ئاو کە هێندەی شاخێک بەنێو ئاودا دەڕۆیتە خوارێ، لێرەدا لەبنی درەیادا جەستەم دەجوڵێنم و لە ئەزموونەکانم بۆ ئێوە دەدوێم یانی مرۆڤێکی حەکیم منی بۆ بنی دەریا گێڕایەوە، دوای ئەوەی ڕێم لەماڵی کەوت ئەو دەمەی لەتاریکی شەودا دەستی بۆ ئاسمان هەڵدەبڕی و خوڕ خوڕ فرمێسکەکانی دەهاتنە خوار، چاوی دەبڕیە چاوی هەمیشە کراوەم و لەنەوتراوەکانی چاوم دەگەیشت، پاشان یەکە و ڕاست شوشەکەی هەڵگرت و سەدان شار و دێ و

سارای بڕی تا گەیشتە کەنار دەریا و ئەوجا شوشەکەی بەرە و دەریا لار کردەوە و من لەگەڵ ئاوی شووشەکەدا ڕژامە دەریا و، ئیدی من دوای پانزە ساڵ ژیان لەنێو شووشەدا جارێکی دی بۆ فراوانی دەریا گەڕامەوە، دوای ئەوەی بۆلای ئەو مرۆڤە وەرچەرخام ئەوم بینی شووشە خاڵیەکەی بە دەستەوە بوو و راست وەستابوو و بەفراوانی دەریای دوور دەیڕوانی وەک بڵێی لەگەڵ دەریادا ڕاز بگۆڕێتەوە، منیش بۆ دواجار بەچاوی ماسیانەی خۆم ئەوی مرۆڤم بینی و رووم لە قوڵایی دەریا کرد و ئەوم بەجێهێڵا). ئەمە دوایین قسەی ماسیە گەڕاوەکە بوو ئەنجامەکانی ئەزمونەکەی هێمنی و ئارامی و ناسکی دەریای شڵەقاند بۆیەکەمجار جیاوازی لەنێوان بیرو رای ماسیە حەکیمەکاندا دروست کرد.

# نزاکانی ماسی

ماسیە مامۆستاکە لە هەموو ماسیە حەکیمەکانی دی زۆرتر لە قسەکانی ماسیە گەڕاوەکە دەگەیشت، چونکە یەکەم: ئەم مامۆستای بوو، واتە زۆرتر بە ڕۆحی ئاشنا بوو، دووەم: ئەمیش دەمێک بوو هەستی بە نەدیتراوی و فراوانی جیهانی ڕاستەقینەی مرۆڤ کردبوو (بەڵکو یەکبوونی ماسی و مرۆڤ) ئەو هەمیشە لەو قسانەدا بێ بزواندنی جەستەی دەیکردن، واتە لەو قسانەدا کە بۆخۆی دەیکردن لەبەرئەوەی هەرکاتێک ماسی بۆ ماسیانی دیکە بدوێت دەبێت بە بزواندنی جەستەی قسەیان بۆ بکات، بەڵام ئەو دەمانەی بۆ خۆی یان بۆ خوا دەدوێت (واتە، کاتێک نوێژ دەکات) ئیدی پێویستی بە بزواندنی جەستەی نییە، ئەو دەمێک بوو هەستی بە خۆشی و فراوانی ڕۆح و دڵنیایی و گەرمی عیشق و پەیوەندی بەئاسمانەوە کردبوو، بەڵام ئەوەی لای ماسیەکانی دیکە نەدرکاندبوو، یاخود بۆی نەلوا بوو بۆیان

بدرکێنێت، چونکە هەموو ماسیەک تەنیا یەک جار هەلی هەیە بۆئەوەی بۆ ماسیە حەکیمەکانی دەریا بدوێت، ئەویش ئەو دەمەیە کە لەسەفەری بێ کۆتایی جیهانی مرۆڤ دەگەڕێتەوە یان ئەو کاتەی لە زێدی خۆیەوە جولاوە و بۆیەکەمجار دوای ئەوەی سالانێکی زۆر لە ڕۆیشتن بە نێو قەپ و چڕنووک و تۆڕەکانی مەرگدا گەیشتۆتەوە دەریا، ڕاستە ئەو دەمەی ئەو لەدەرەوەی دەریاوە بۆ نێو دەریا سەفەری کردبوو ماسیە حەکیمەکانیش بەو پەڕی ئارامیەوە گوێیان بۆ گرتبوو... بە گێڕانەوەی ڕووداوە سەیر و نوێکان هەموو ماسیانی ئەبلەق کردبوو...

دوای ئەوەی پانزە ڕۆژ بەتەنیایی لەگەڵ دەریادا دوابوو بۆ ئەوەی ئولفەت و ئارمی خۆی بەدەست بهێنێتەوە و لە ترسەکانی ڕێگا قوتاری ببێت و هێوری دەریای بۆ بگەڕێتەوە، بەڵام ئەم تا ئەوکاتەش باوەڕی بەزانینی شتە دیتراوەکان هەبوو، تا ئەو کاتەش فراوانبوونی دەریای بۆ کەشف نەبوو بوو، تا ئەو کاتەش مرۆڤی وەک گیانداریکی شەڕانی و ماسیشی وەک مەخلوقێکی بێ دەسەڵات لەبەر دەستیدا سەیر دەکرد... ئەم نەیدەزانی تەنیا بۆ خۆی بدوێ و نزاکانی بۆ سەر و ئاسمانەکان و ڕۆحی لەبنی قوڵی دەریاوە عروج پێبکات... بە نوێژەکانی

لەگەڵ خوای خۆی ڕاز و نیاز بگۆڕێتەوە، ئەگەر نوێژی زۆربەی مرۆڤەکان بەشێکی زۆری بە بزواندنی جەستەیان بێت وەک هێمایەک بۆ گەیاندنی ماناکانیان، ئەوا ئەمانی ماسی تەنیا لە قسەکردنی ناو نوێژ و تێڕاماندا جەستەیان سکونەت پێ دەکەن، هەوڵ دەدەن بەیەکبار و لەیەک جێگادا ڕایبگرن، ئەوانی ماسی دەیانەوێت نوێژەکانیان بێجوڵە و هاوتا لەگەڵ نوێژی دەریا لەکاتی ئارامی خۆیدا بێت و ئەوان پێیان وایە با و شەو و مانگ و خۆر و هەموو ئەستێرە و فریشتەکان ڕێز لە نوێژەکانی دەریا دەگرن، بۆیە هەرگیز ئارامی تێک نادەن و لە دوورەوە سەلامی بۆ دەنێرن، لەکاتی نوێژدا دەریا و دنیا کپ و ئارامە و ئەمانی ماسی پێیان وایە (خوا) بەچاوی کراوەی ئەمان نەبینراو گوێی لە گوتە نەگوتراوەکانی ئەمانی ماسی و خاک و با و مرۆڤە، بەڵام ئەم دوای ئەمە ئیدی بواری قسەکردنی لەبەردەم ماسیاندا بۆ نەڕەخسابوو، دواتر لەگەڵ تێپەڕ بوونی تەمەن و قوڵبونەوەی ئەزمونەکانی و فراوانبوونی ڕۆحی و کەشف کردنی جیهانی ناوەوەی بەو گەشتە ناوەکیانەی ماسی بۆ ئەو جیهانەی دەکات، ئەو جیهانەی تەنانەت ئاویش بەو هەموو کەرەم و چاکانەی لەگەڵ ئەمانی ماسی دەیانکات،

تەنانەت ئاویش دەستی پێڕاناگات، جیهانێکی گەورە و فراوان لە گەشتی ماسی بۆ نێو ئەو جیهانە، لە چوونی ماسی بۆ ئەو جیهانەدا پێویست بە بزواندنی جەستە و هەرچی زیاتر بینین ناکات، لەوی تەنیا فراوانیی تێڕامان پێویستە، هەرچی پوختەتر بوونی ئەزمونەکان لەوێ زیاتر هێوربوونەوە و ئارامی ڕۆحی لەگەڵ خۆی دەردەخات.

ئەگەر هەموو ماسیەکی گەڕیدە و گەڕاوە لە جیهانی مرۆڤ بەتەنیا گەشتی پڕ لە مەترسی بۆ ئەو جیهانە ئەنجامداوە، ئەوا دوای ئەوەش پێویستی بەسەفەرێکی دیکەی تەنیا هەیە هەتا هەموو دیوەکانی وجودی لەلا نمایان ببێت، سەفەرێک تەنیا و ئارام تەنانەت بزواندنی جەستەشی ناوێت، تەنانەت ئەگەر بشیایە چاوی ماسی لێلایی دابهاتەیە و بنوقایە... دەبوو باش بینوقێنێ بۆ سەفەرێک بۆ جیهانی نەدیتراوی حیکمەت و بۆلای خودا.... سەفەرێک هەرچی زۆرتر بوونی ئەزموونەکانی، هەرچی زیاتر کرانەوەی ڕێگاکانی ئەو سەفەرەیە و ڕێگاکانی چوون بۆ ئەو جیهانە لای هیچ ماسیەک وەک هیچ ماسیەکی دیکە نییە، واتە ئەگەر هەزاران هەزار جۆر ماسی هەیە، ئەوا هێندەش ئەزمونی جیا و ئەوەندەش ڕێگەی گەیشتن بە خودا هەیە، ئەگەر ماسیە قوتابیەکەی

لەتەنیایی چەند ساڵەی نێو شوشەدا بەو دەرئەنجامە گەیشتبوو، بۆیە هەلی بۆ ڕەخسا لەبەردەم کۆی ماسیە حەکیمەکاندا باسی لێوە بکات، ئەوا ئەمی مامۆستای لەئەو بەتەمەنتر لە دوای گەڕانەوەی لەو گەشتە چەند ساڵەییە و پاش ماوەیەکی زۆر لە مامۆستایی و ئارامی ڕۆحی ئینجا ئەو ئەزمونەی لا دروست بوو بوو، بەڵام پوخت و پاک، ئەم نەک هەر لەزەتی لە نزیکی خواو ئونسی ئەو دەبرد، بەڵکو ئاگای لە نزاکانی دەریا و مرۆڤەکانی سەرزەویش دەبوو، تەنانەت گوێی لە بزاوت و باڵ راوەشاندنی فریشتەکانیش دەبوو کە بەنێو ئەستێرەکاندا دادەبەزین و سەردەکەوتن، ئەو ئەستێرانەی سەدان هەزاریان شەوان دادەبەزنە دەریا، فریشتەکان ئارام ئارام باڵەکانیان ڕادەوەشێنن و فریشتە یەک باڵ و دوو باڵ و سێ و چوار تا حەوت سەد باڵەکان، ئەو باڵانەی یاقوت و مرواریان لێدەبارێت، ئەو فریشتانەی بوونیان بە هەموو خۆر و ئەستێرەکانییەوە تەنیوە، ماسی کاتێک بینینەکانی دەبڕێت و بە جیهانی نەدیتراو دەگات ئەو دەمە نزا بێئارام و بێجوڵەکانی دەست پێدەکات و ئەمی پیرە ماسی لەشەوێکی تاریک لەبنی دەریای چەند قات تاریکتردا بێ بزواندنی

جەستەی نزای دەکرد و دڵنیابوو لەوەی کە خودای مەزن ئاگای لەوتە نەوتراوەکانییەتی...

خودایە گیان!!! ئەگەر ڕێگەت بە مرۆڤ داوە ڕۆحی خۆی مەزن بکات و لە جیهانی گچکەی بینراو (ئەو جیهانەی تەنیا تەجەللایەکی بچووکی دەسەڵاتی تۆیە)، بچێتە دەرێ و لەزەت لە ئونس و نزیکی تۆ بەرێت، ڕەنگە ئەمە لە دەگمەنترین و جوانترین شتێک بێت کە مرۆڤەکان لێی بەهرەمەندن... ئەگەر زۆربەی زۆری مرۆڤەکان جەستەیان هەیە و دەبینرێت، چاویان هەیە و دەڕوانێت... زمانیان لە نێو ئەشکەوتی دەمیاندا دەبزوێت و قاچیان هەیە و پێی ڕێدەکەن، دەستیان هەیە و لەزەت لەسافی ماسی لەکاتی دەست لێدانیدا دەبەن، بەڵام خوایە ئەوەی کەمترینی مرۆڤەکانن هەست بەدڵنیایی و نزیکی تۆو حیکمەت دەکەن... ئەگەرچی مانەوەوەی مرۆڤیش بەوەوەیە....

خودایە!!! سوپاس سەدجار سوپاس بۆتۆی بە میهرو کەرەم کە لەو شتە دەگمەنەت بەئێمەی ماسیش بەخشیوە و لەبنی تاریکی دەریای فراواندا لەزەت لە نزیکی تۆی لە ئاو نزیکتر لە ئێمەوە ببەین و ڕاز و نیاز لەگەڵ تۆی خۆشەویست بکەین، هۆ خوای من!!! ئەی ئەو نەدیتراوەی بەچاوی خۆم ئەزموونم نەکردووی، بەڵام لە هەموو بینراوەکان

زیاتر له بوونت یەقینم هەیە، فراوانی تۆ نەک دەریای فراوان... دەریا بەهەموو ماسی و نەهەنگەکانی ناوسکی، بەڵکو خاکیش بە هەموو شاخ و شارەکانی ئەو شارانەی ژمارەی چراو گلۆپەکانیان لە ئەستێرە زۆرتر لەشارەکانی ئاسمان قەرەباڵغترن، نەک کۆشکە گەورەکانی مرۆڤ، ئەو کۆشکانەی دوورترین شوێنی دەریایان تێدا دەدۆزرێتەوە و ئەو کۆشکانەی سەدان ئەوەندەی جەستەی مرۆڤەکان گەورەترن...بگرە هەموو بیابان و ساراکانیش ئەو سارا فراوانانەی تەنانەت بە (با)ی خێراش چەندین ڕۆژ ڕۆشتنی بێوەستان تەی ناکرێن... نەک هەر زەوی ئەو زەویەی مانگی ناسک بە چرای داگیرساوی و دەموچاوی خۆی پێیدا دەڕوات و سەفەر دەکات، دەڕوا و دەڕوات و دەیەوێت ئەمپەڕ و ئەو پەڕی بزانێت بەڵام هەمیشە حسابەکەی لێتێکدەچێت و سەر لەنوێ هەڵدەکاتەوە... نەک هەر خۆری گڕگرتوو و ئەستێرەکان، هەموو ئەو ئەستێرانەی بست بەبستی ئاسمانیان تەنیوە و تاکە هاوڕێی ماسیانن لەدەرەوەی دەریا کەلە دوورترین جێگەی دەریا جەستەی نوورینیان پیشانی ماسی دەدەن و دەڵێن ئەها ئێمە لێرەین، ئەستێرە لە هەموو شوێنێک بوونی هەیە و ئێمە ڕێنمویی دەکات...

هۆ خوایه گیان!!! نەک هەر ئەو ئەستێرە خرە بچووکەی کە پێی دەوترێت زەوی، کە لەچاو بووندا وەک دەنکە نیسکێکە لە چاو شاخێکدا، نەک هەر ئەو ئەستێرە بچووکە و مرۆڤە بچووکەکانی سەر ڕووی بەهەموو ڕەنگ و زمانە جیاوازەکانیانەوە... ئەو هەموو گیاندار و مارو مێروەی ژیانیان شێوازی جیاوازی ژیانیان، دەریا و گیاندارانی سکی لە منی ماسی بەقەد پێیەکی مرۆڤ بچووک بچووک، تا پەپولەی ئارامی نێوان دوو پەنجەی منالێکی بزێو کە بەدەمی فوو لە باڵەکانی دەکات و لە ئاسکیدا دەوەرن، تا هەموو دارو درەختەکان، کە پایزان نەخۆشی زەرد هەڵگەڕان دەیانگرێت و یەکەیەکە گەڵاکانیان دەوەرن وهەندێکیان دەکەونە نێو جۆگەئاو و ئاویش بەسەر سەر هەڵیاندەگرێت تا هەموو گوڵەکان، ڕازی بوون و پێکەنینیی تۆ پیشان دەدەن و بەو پێکەنینەیان جارجار (با) تورە دەکەن و با هەندێکیان دەوەرێنێ و هەندێک جاریش لەگەڵیان ئاشت دەبێتەوە و لەگەڵیان دێت و دەڕوا، ئەی خودایە دەسەڵاتی تۆ لە هەموو ئەوانە فراوانترە .

ئەی خوای خۆشەویست!! ئەم بوونەی کە پڕە لەپەردەی ناسکی دادراو و نهێنی، تۆ نهێنی هەموو نهێنییەکانی، ئەگە تۆ نەبیت هیچ نهێنییەک بوونی نییە،

بەو نهێنییەی خۆت ئێمەت بۆلای خۆت بەڕێخستووە و (مرۆڤ و ماسیان) بگرە هەموو بوون (بەدەریا و باو خاکیەوە) بە چپە ڕاز دەگۆڕینەوە و لەسەر خۆ هەنگاو هەڵدەگرین و بۆ لای تۆ دێین، دەمانەوێت لە لاوازی خۆمان هەڵبێین و مەزن و جوان و ئارام بین، بەلام هەمدیس هەتا بڕۆین دووبارە هەر بەندەی لاوازی تۆین، خوایە! تەنیا لاکردنەوەیەکی تۆ بەسە بۆئەوەی بەکامی دڵمان بگەیەنێت.

هۆ خوای لە هەموو جوانییەک جوانتر تۆ دەریات خوڵقاندووە کە هەموو شتێک بۆ ئێمە بکات، بەجۆرێک ئێمەی ماسی ناتوانین دەرکی چاکەکانی ئاو لەگەڵ خۆمان بکەین تا نەچینە دەرەوەی دەریا، ئاو هەموو بوونی ئێمەیە و ئاو هەموو شتێکمان بۆ دەکات و خۆشیمان لێ پەنادەدا، بۆیە ئێمەی ماسی لەناو ئاودا ئاو نابینین، ماسی کە دەچێتە رووی دەریا ئەوجا هەست بە فراوانی دەریای پەنهان لە خۆی دەکات، فراوانی تۆی نەک بەقەد دەریا، بەڵکو لە فراوانی هەموو بوون فراوانتری بۆ دەردەکەویت.

ئەی خوایە!! هەروەک چۆن دڵۆپە بارانەکان پەیامی شوێنە دوور دوورەکان بۆ دەریا دەهێنن هەرکام لەوەی تۆ دروستت کردووە پەیامێکی تۆی بۆ ئێمە پێیە، بەلام تۆ پێویستت بە هیچ شتێک نییە تا

پەیامی ئێمەت بۆ بهێنێ چونکە تۆ ئاگاداری هەموو شتێکی ئێمەیت.

خوایە گیان ئەگەر مرۆڤەکان لەنێو خۆیاندا زۆر شتی هاوبەشیان هەیە، زمانی هاوبەش، نیشتمانی هاوبەش، خێزان و غەریزەی هاوبەش، بەڵام خوایە گیان (تەنیاترین قسە و سات و چێژ و ئارامی ساتەکانی حزووری بەردەم تۆیە... هەموو مرۆڤێک کە ئەگاتە ئەو ساتانە خوازیاری ئەوەیە قەد نەگەڕێتە دواوە و جارێکی دی چاوی بەشەڕەکانی مرۆڤ نەکەوێتەوە، بەڵام خۆ مرۆڤ بۆئەوەی بگاتە ئەو مەقامە دەبێت هەزاران هەزار فرسەخ بەنێو جیهانی خۆیدا تێپەڕ بووبێت، ئەو جیهانەی سەدان شار و دەریا و بیابانی تێدایە و بەهەموو گیانی خوێناویەوە تا توانیبێتی لەشەڕە بینراوەکانی مرۆڤ قوتاری بووبێت، لەپێناو ئەو دوورکەوتنەوەیە لاواز و وشک بووبێتەوە تا زیاتر تینووی لیقای تۆ و پاشان زیاتر لەزەتی لێبەرێت، ئەگەر ئاویش بۆ ئێمەی ماسی هەموو شتێکە، ئەگەر ئاو ئێمە پاک دەکاتەوە، جوڵە بە ئێمە دەدات، سکی خۆی کردووەتە جێی خۆراکی ئێمە، ئەگەر دەریا کتێبێکی گەورەیە و بۆ خوێندنەوەی هەموو دەریا دەگەڕێین، ئەگەر ئێمە هەموو جەستەمان دەدەینە دەست دەریا و خۆمان

لەبەردەستیدا ڕادەخەین، ئێمە بێئەوەی بزانین ئەو کاتەی لەسینگی شەپۆلێکدا خەریکی جوڵەی خۆمانین، شەپۆل بۆ قوڵایی دەریا فڕێمان دەدات، ئێمە ئەرکی خۆمان بەرامبەر دەریا جێبەجێ دەکەین، ئاو لە زمانی ئێمە تێدەگات و ئێمەی خۆش دەوێت هەروەها ئێمەش، بەڵام ئێمەی ماسیش ساتی تایبەت بەخۆمان هەیە، ئەو ساتە تایبەتیانەی تەنانەت ناوی خۆشەویستیش دەستی پێڕاناگات، سەفەری قوڵی ناوەکی، تێیدا هەست بە ڕووی نەدیتراوی بوون دەکەین، ئەو ڕۆحەی چاوی کراوەی هەموو ماسیەک نایبینێت، ماسی لەو ساتەنەدا بەتەریبی لەگەڵ ڕۆحی دەریا، نەک وەک بەشێک لەدەریا، هەست بە نزیکی لەگەڵ خواو وەک مرۆڤە عاریفەکان حزوور لەبارەگای ئەو هەست بە مەزنبوونی ڕۆحیان دەکەن، تا ڕۆحی بەقەد هەموو دەریا گەورە، بەڵکو زۆر گەورەتر بێت، دەستی نزیکی تۆ وەک سەهۆڵ لەبەردەم جوانی تۆدا دەتوێتەوە ئەی خودایە.!!

ماسیە پیرەکە لەبنی دەریادا بەشێوەیەک سنگی بەر لمی دەریا دەکەوت هەستی بە جوڵانێکی نەویستانەی جەستەی دەکرد، وێنەی دەریا و ئەستێرەکان و فریشتە و هەور و خاک و مرۆڤەکان دەهاتە بیر کە لە نوێژێکی قوڵدا بوون، دەیوت خوایە:

ئەم جەستە پیر و ڕووخاوەی من بەرگەی ڕۆحی ڕۆشن و گەرم و داگیرساو بە نووری تۆ ناگرێت، ئەی خوایە ئەگەر نەڕوات جەستەی بەسەردا دەڕوخێت، با ڕۆحم بڕوا و جەستەش وەک هەزاران جەستەی دیکەی مردووی نێو هەناوی دەریا ئاو فڕێی بداتە دەرەوەی خۆی، ڕۆحم چاکەکانی ئاو و خۆشیەکانی ساتی تەنیا و ئارامی مەزنی ڕۆح و زیکرەکانی تۆ لەبیر ناکات، با ڕۆحم بەنێو پەردە ناسکەکانی ئاو و هەواو ئەستێرەکان بۆلای تۆ بڕوات.

جەستەی ماسیە پیرەکە ئاو بۆ دەرەوەی خۆی دەیبزواند و هەموو ماسیە حەکیمەکان شوێن جەستەی بێگیانی وەک دوا ماڵئاوایی کەوتبوون و بیریان لە ڕۆحی نەبینراوی ئەویان بەچاوی ماسیانەی خۆیان دەکردەوە.

کۆتـایی